# پێنج بابەت لە ئایینزاو باوەڕمدا

نووسینی

عەبدوڵلآ ئیبراهیم مەلا عەبدوڵلآ هەرشەمی

٢٧١١كوردی ـ١٤٣٢كۆچی ـ ٢٠١١زاینی

# پێنج بابەت لە ئاینزاو باوەڕمدا

نووسینی

عەبدوڵلآ ئیبراهیم مەلا عەبدوڵلآ هەرشەمی

٢٧١١کوردی - ١٤٣٢کۆچی - ٢٠١١زاینی

بسم الله الرحمن الرحيم

بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

پێشکەشە بە:

گیانی پاکی زانایانی هەرشەم، کە هەمیشە چراو مەشخەڵ بوون بۆ زانست و ئایینپەروەری، لەم بوارەدا چەندین ڕۆڵەی بە ئەمەک و شارەزایان پەروەردە کردو پێگەیاند.

عەبدوڵڵا هەرشەمی

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودای مەزن و پەروەردگاری هەموو بوونەوەر، کە دەرفەت و بواری بۆ ڕەخساندم تا ئەوەی لەناو هزرو مێشك و دڵ و دەروونمدا هەیە بیخەمە ناو ئەم نامیلکەیە.

سڵاو و ڕەحمەتی خودای مەزن برژێت بەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان (درودی خودای لێبێت) و کەسوکارو یارو یاوەرەکانی و هەموو ئەوانەی لەسەر ئایین و ڕێچکەی ئەون.

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لەم سەردەمەدا ئایین پەروەری یەکجار ڕووی لە کزبووندایە، خەڵك بەرەو هەڵدێرو بێ باوەڕی هەنگاو دەنێن، جاران ئەگەر یەکێك کارێك یان ڕەفتارێکی پێچەوانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی ئەنجام بدابوایە، ئەوا لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا بەچاوێکی سووك سەیر دەکرا، لەلایەن خزم و دۆستانی سەرکۆنەو سەرزەنشت دەکرا، چونکە خەڵك لەسەر بنەمای ئایینی پەروەردە کرابوون، تەنانەت داب ونەریت و کلتوری کوردەواری شوێنپەنجەو مۆرکی ئایینی پێوە دیاربوو، کەچی ئێستا لە ئاکامی نەمانی بەهای ئایینی لە دڵەکانمان،ڕۆژانە بەدەیان جۆرە کاری قێزەون و قەدەغەکراو لە ئارادایەو زۆر بەسەربەرزی و شکۆمەندی ئەنجام دەدرێن، کەچی کەس بایەخیان پێنادات و لە ئاستیاندا بێدەنگن چۆن تێکڕای خەڵك وێڵ و سەرگەردانن سەرقاڵی هێنانەدی حەزو ئارەزووەکانیانن.

تەنانەت هەندێ کەس نازانن باوەڕهێنان و ئایین و ڕێگای خوداناسین و دوا ڕۆژ چیە؟!.

چۆن هەمیشە خەریکی ماڵ و سامان کۆکردنەوەو هێنانەدی حەزو ئارەزووەکانی وورگ و دامێنیانن، ئەمجۆرە کەسانە هیچ ئاشنابوون و شارەزاییان لەگەڵ ئایین نەبووەو نیە، بگرە دەربارەی دەوروبەرو تەنانەت خودی خۆیان شارەزاییان نیە،

چونکە نازانن بۆچی هاتوونەتەدی و دروستکراون!، مێرووله ئاسا سەیری ئەم جیهانە یان ئەم گەردوونە دەکەن، چۆن مێرووله پێیوایە سەرجەم ئەم گەردوونە بریتیە لەم پانتاییە کەمەی هەمیشە تێیدا دێت و دەچێت، هەروەها بەدرێژایی تەمەن و ژیانی یەك جۆرە کار ئەنجام دەدات، ئەویش بریتیە لە گواستنەوەی دانەوێڵەو برە خۆراکێك و کۆکردنەوەی لەو قوژبنەی تێیدا دەژیت، ئیتر لەم کارە بەملاوە لە ژیانیدا هیچ ئامانجێك و مەبەستێکی دیکەی نیە، بۆیە بەلای ئەوەوە جیهان و ژیان بریتیە لەم چەند مەترە زەویەو ئەو برە خۆراکەی بەدەستی هێناوە، ئیتر لەوە پتر تێناگات و نازانێت چ باس و خواسە.

بەلام ئەگەر ئێمە بەراوردێك لە نێوان ئادەمیزاد و مێروولەدا بکەین، دەبینین ئادەمیزاد خاوەن مێشك و بیرکردنەوەیە، دەزانێت ئەم شارە مێروولەیە بەم قەبارە بچووکەیەوە بەشێکە لەگۆی زەوی، گۆی زەویش بەشێکە لە کۆمەڵەی خۆر، خۆرو کۆمەڵەکەی بەشێکن لە گالاکسیێك کە سەد هەزار ملیۆن خۆری دیکە دەگرێتە خۆی، جگە لەوەش سەد هەزار ملیۆن گالاکسی تر لەم گەردوونە فراوانەدا هەیە، هەموویان لە بۆشایی ئاسماندا دەخولێنەوەو دێن و دەچن، ئەمە هەمووی تەنیا ئاسمانی یەکەمە کە پێیگوتراوە ئاسمانی جیهان!، ئەویش بەشێکە لە حەوت ئاسمان، تا ئێستا زانست نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی بتوانێت لێکۆڵینەوەو پشکنین سەبارەت بە ئاسمانەکان بکات، تەنانەت دەربارەی ئاسمانی جیهانیش هەرچەندە لێکۆڵینەوەی چڕوپڕ هەمیشە لە ئارادایەو بەردەوامە، وێڕای ئەوەش زانایان نەگەیشتوونەتە مشتێك لە خەرواڵێك.

هەرچەندە ئادەمیزاد ئەم ڕاستیەی ڕابردوو دەزانێت، بەلام وێڕای ئەوەش زۆربەیان مێرووله ئاسا ژیان دەبەنە سەر، ئاوات و ئامانجیان تەنیا لە خواردن و خواردنەوەو ڕابواردندا بەدیدەکەن، سەرەڕای ئەوەی پەروەدگاری مەزن ڕێزی تایبەتی بۆ ئادەمیزاد داناوە چۆن زانست وهزرو هۆش وبیرو ویست و خواستی پێ بەخشیوە،

بەڵام هەندێکیان تەکان نادەنە خۆیان، بەڵکو خۆیان لە قوژبنێکی تەنگ و تاریك حەشارداوە، تەنیا بیر لە حەزو ئارەزووەکانیان دەکەنەوەو چیتر نا.

بەڵام پەروەدگاری زاناو داناو پڕتواناا،بۆیە زانست و هۆش و بیری داوەتە مرۆڤ تا لەم کونجەی تێیدا گۆشەگیرە بێتەدەرەوە، سەیری ئەم گەردوونە فراوانە بکات، سەرنجبداتە ئەم هەموو بوونەوەرە و بیربکاتەوە، هەنگاو بنێت و پەرە بەزانیاری و زانستەکانی بدات و فراوانتریان بکات، بیر لەخودی خۆی بکاتەوە:

ئایا بۆچی هاتۆتەدی و دروستبوە ؟.

ئایا لەم بوونەوەرانەی ئەو دەیانبینێت بەملاوە، هیچ بوونەوەرو دروستکراوێکی تر هەیە؟.

ئەگەر بوونەوەرو دروستکراوی دیکە هەیە بۆچی شاراوەن و دیارنین؟.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانەو چەندین بابەتی دیکە، ئەم نامیلکەیە هاتۆتەکایەوەو پێنج بابەت دەگرێتەخۆی:

بابەتی یەکەم: پێویستە چ زانست وزانیارییێکمان دەربارەی خودای پەروەردگار هەبێت؟.

بابەتی دووەم: پێویستە چ زانست وزانیارییێکمان دەربارەی پێغەمبەران(درودو سڵاوی خودایان لێبێت) هەبێت؟.

بابەتی سێیەم: پێویستە چ زانست و زانیارییێکمان دەربارەی فریشتەو پەری هەبێت؟.

بابەتی چوارەم: چ دەزانین دەربارەی مرۆڤ؟.

بابەتی پێنجەم: چ دەزانین دەربارەی مردن؟.

بۆیە ئەم بابەتانەم هەڵبژاردوەو ورووژاندوە، بەڵکو لە میانەی ئەم بابەتانەوە بتوانم خوێنەران بەخودی خۆیان واتە بەخودی مرۆڤ ئاشنا بکەم، چونکە ئەگەر خودی خۆمان بناسین، ئەو کاتە پەروەردگاری خۆمان چاکتر دەناسین.

کاتێ زانیمان ئێمەی ئادەمیزاد چەند بێ هێزو تواناو بێ دەسەڵاتین، واتە خۆمان بەبچووك و لاواز بینی، ئەوکاتە پەروەردگاری خۆمان بە مەزن و پڕهێزو توانا دەزانین.

سەرەڕای ئەوە، ئەگەر ئێمە زانیاریمان دەربارەی خوداو پەروەردگاری خۆمان نەبێت و نەیناسین، چۆن خودا پەرستی بکەین؟.

بێگومان خوداپەرستیش ئەرکە،لەسەر هەموومان پێویستە ملکەچ بین بۆخودا، هەمیشە خۆمان بە کۆیلەو بەندەی خودا بزانین، فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین.

کەواتە ناسینی خودای مەزنیش ئەرکەو پێویستە لەسەرمان بیناسین، چونکە پەرستنی خودا بەندە بەناسینی.

لێرە دەبینین (ناسین و پەرستن) هەردووکیان ئەرکن و پێویستن لەسەر ئادەمیزاد، بێگومان ئەگەر دوو شت بەیەکەوە بەندو بەستراو بوون، ئەوا هەردووکیان وەکو یەکن.

هەروەها پێویستە ئادەمیزاد خۆی بناسێت، ئینجا دەتوانێت پەروەردگارو خودای خۆی بناسێت، کەواتە ناسینی خودی مرۆڤیش ئەرکەو پێویستە، چونکە ئەگەر یەکێك زانیاری سەبارەت بەخودی خۆی نەبێت، ئەوا بێگومان سەبارەت بەخوداو پەروەردگاری مەزنیش زانست و زانیاری نیە.

جا لێرە پێویستە لەسەر مرۆڤی هۆشمەند کات بەفیڕۆ نەدات، هەوڵ بدات بەدوای ئەم ئاشنابوون و ناسینەدا بچێت، پێش ئەوەی بەنەزانی و کۆڵەواری بگەڕێتەوە بەردەم پەروەردگار، چونکە بەردەوامبوون لەسەر کاری ناڕەواو نابەجێ کارەساتێکی گەورەو زیانبەخشە، نەك بۆ خودی خراپەکاران، بەڵکو بۆ تێکڕای کۆمەڵگە، واتە بۆ نەزانان و بۆ زانایان.

ڕەنگە یەکێك بڵێ بۆچی تێکڕای خەڵك دەگرێتەوە،لەوەڵامدا دەڵێین زیانەکەی:

بۆ نەزانان: چۆن سەرپێچی دەکەن لەو ئەرك و فەرمانانەی خودای بەرزو بالآدەست بۆی داناون، کەبریتیە لە شارەزابوون لە ئایین و زانینی ڕێگای خواپەرستی، بێگومان پشتگوێ خستنی ئەم ئەرك و فەرمانانە بۆیان دەبێتە کارەسات و دوور کەوتنەوە لە ئایین، وێڕای ئەوەش بۆیان دەبێتە نەهامەتی و نائارامی و شەرمەزاری ئەمڕۆو دوا ڕۆژ.

بۆ زانایان: ئەوکاتە دیارە زانایان کەمتەرخەمیان کردوە لە جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانیان، بانگەوازی خەڵکیان نەکردوە بۆ ڕێگای خواناسین و خواپەرستی، خەڵکیان هوشیار نەکردۆتەوەو ئاشنایان نەکردوون بەم ئەرکانەی پێویستە لەسەریان سەبارەت بە ئایینەکەیان بیزانن، سەرەڕای ئەوەش بێدەنگیان لە ئاست ئەو ڕەفتارو کردارە ناهەموارو تاوانانەی خەڵك ئەنجامیان دەدەن، زیان بەخشە بۆیان.

سەبارەت بە زانایان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) فەرموویەتی:

**(ویل للعالم من الجاهل حیث لا یعلمه).**

واتە: (وەیل) کە دۆڵێکە لە دۆزەخ، یان ئازارو ئەشکەنجە بۆ زانایان سەبارەت بە نەزانان چۆن فێریان ناکەن و تێیانناگەیەنن.

لەم فەرموودەیە پیرۆزە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە فێرکردنی نەزانان ئەرکە لەسەر شانی زانایان، چونکە ئەگەر ئەرك نەبێت بەسەریانەوە بۆچی زانایان دەخرێنە ئەم (وەیلەوە)، بێگومان خودای بەخشندەو میهرەبان ئەوەندە بەزەیی زۆرە هیچ کەس ئازارو ئەشکەنجە نادات لەسەر کارێك کە ئەو کارە ئەرك نەبێت بەسەریەوە، کەواتە دیارە ئەرکی فێرکردنی نەزانان کەوتۆتە سەرشانی زانایان، جا هەرکاتێك زانایان ئەو ئەرکە جێبەجێ نەکەن، ئەوا دەکەونە بەر ڕق و تووڕەیی خودای مەزن بۆیە ئازاریان دەدات.

بەڵام لێرە پێویستە ئەوەش بڵێین، ئەم ئەرکە تەنیا نەکەوتۆتە سەرشانی مامۆستایانی زۆر شارەزا کە لە دەریای زانست و زانیاریدا مەلەدەکەن، بەڵکو سەرجەم خەڵك دەگرێتەوە، تەنانەت ئەوەی یەك شت دەربارەی ئایین بزانێت پێویستە ئەو شتە بە خەڵك ڕابگەیەنێت، پەروەردگاری ئێمە لە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوەدەکات، هەروەکو لەم ئایەتە پیرۆزەدا خودا فەرموویەتی:

﴿ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾

مانای پیرۆزی: کاتێ ئەوەی پێیانگوترابوو لەبیریانچوو کاریان پێینەکرد، ئەوانەی خراپەیان نەدەکردو دەیانگوت مەیکەن، ڕزگارمان کردن، وەئەوانەی ستەمیان کرد تووشی ئازارێکی ناخۆشمان کردن بەهۆی کردەوە خراپەکانیان.

سەرەڕای ئەوەش پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرموویەتی:

**من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الأيمان).**

واتە: هەریەکێك لەئێوە کردەوەیەکی ناڕێکوخراپی بینی با بەدەست بیگۆڕێت و لایبدات، ئەگەر نەیتوانی با بەزمان پێیبڵێ و لایبدات، ئەگەر نەیتوانی با بەدڵ پێیناخۆش بێت، ئەوەیان لاوازترین و بێهێزترین باوەڕە.

هەروەها (ئیمام ئەحمەد) لەسەر زاری بیلالی کوڕی سەعید دەڵێ پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) فەرموویەتی:

**(الخطيئة إذا خفيت لا تضر إلاّ بصاحبها، وإذا ظهرت فلم تغير ضرت العامة).**

واتە: تاوان و کردەوەی نابەجێ ئەگەر شاراوەبوو دیارنەبوو ئەوا زیانەکەی تەنیا بەخاوەنەکەی دەگات، وە ئەگەر بە ئاشکرابو لانەدرا زیانەکەی گشتیەو بە تێکڕای خەڵك دەگات.

کەواتە لادانی تاوانباران لەسەر کاری ناڕەوا ئەرکێکە دەکەوێتە سەرشانی گشت خەڵك، بۆیە هەموویان زیانیان پێدەگات.

هەروەها (عەبدوڵلای کوڕی عەباس ـ خودا لە هەردووکیان ڕازیبێت) دەڵێ:

گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەربێت) ئایا شارێك کاول دەکرێت کە پیاوچاکانی تێدابێت، فەرمووی: بەڵێ، گوتیان بەچی ئەی پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەربێت) فەرمووی:

**(بتهاونهم و سكوتهم على معاصي الله).**

واتە: بە بایەخ نەدان و گوێنەدان و بێدەنگیان لەئاست ئەنجامدانی تاوان و لە خودا یاخیبوون.

دەبێ ئەوە بزانین، چۆن پێویستە لەسەرمان خەڵك لە خراپەکاری لابدەین، ئەوەندە زیاتر پێویستە لە پێشدا خۆمان لەکاری ناڕەوا و نابەجێ و تاوان بپارێزین. ئەگینا وەك ئەوە وایە مارو دوپشك لە ژێر کراسەکانمان بێت کەچی (مێشکوژێك) لە دەستبگرین و دەم و چاوی یەکێکی دیکە لە مێش بپارێزین.

وێڕای ئەوەش ئەگەر یەکێك کردەوەکانی ناڕێك و ناپەسند بێت، هەمیشە کاری نابەجێ و تاوان ئەنجامبدات، ئەوا ئەو کەسە هەرگیز ئامۆژگاریەکانی کاریگەری نابێت لەسەر خەڵك، هەروەکو خودای مەزن بە (عیسای کوڕی مەریەم ـ سڵاوی خودای لێبێت) دەفەرمووێت:

(ئامۆژگاری خودی خۆت بکە، ئەگەر خۆت پەندت وەرگرت و ئامۆژگاریەکانت لە گوێ گرت، ئەو کاتە ئامۆژگاری خەڵك بکە، ئەگەر نا شەرم لەمن بکە).

کەواتە پێویستە ئەوانەی ئامۆژگاری خەڵك دەکەن، دڵ و دەروونیان پاك و بێ گەردبێت، چونکە بە جلوبەرگی پۆشتەو نایاب و جوان، بەدڵێکی تاریك و چڵکن و قرێژاوی، هەرگیز کاریگەری ناکرێتە سەر دڵانی دیکە، لەبەر ئەوەی دڵی ڕووناك وشەی پڕ لە ڕووناکی تێدا هەڵدەقوڵێت، قسەو وتەی دڵی ڕووناك هەمیشە دەگاتە ناو دڵی خەڵك، بەڵام قسەی زمان لە گوێچکە تێپەڕ ناکات.....

عەبدوڵڵا هەرشەمی

٢٠٠٦/١٢/٢٦

# بەشی یەکەم

## پێویستە چ زانست و زانیارییەکمان دەربارەی خودای پەروەردگار هەبێت

**قۆناغەکانی بیر کردنەوەی مرۆڤ :**

دوای ئەوەی نەوەکانی ئادەم(سلاّوی خودای لێبێت)زیادیان کردو پەرەیان سەند، چەندین بنەماڵەو تیرەو هۆزو گەل و نەتەوەیان لێکەوتەوە، ئیتر بەناو گۆی زەویدا پەرتوبلاّو بوون، وێڕای ئەوەش بە تێپەڕبوونی کات بەرەبەرە لە ئایین و ڕێچکەی باوك و باپیرانیان دوورکەوتنەوە، دەرەنجام هەندێ میللەت و نەتەوە هاتنە کایەوە لەسەر هیچ ئایینێك نەبوون، هیچ ئایینزاییێکیان لە دڵ و دەرووندا نەچەسپابوو بگرە هەرنەبوو.

بەلاّم بێگومان ئادەمیزاد هۆش و بیرکردنەوەی هەیە، لە ئاکامی بیرکردنەوەیدا هەست و بۆچوونی جیاجیا سەبارەت بە بوونەوەرەکانی دیکەی دەورو بەری هاتنە ئاراوە، وەك دیدو بۆچوونی دەربارەی ئاسمان و ئەستێرەکان و هەسارەکان و چەندین بوونەوەری دیکە، ئیدی هزرو بیرکردنەوەیان بەجۆرێك گڕی سەند تەنانەت کەوتنە لێکۆڵینەوەی بارودۆخی جۆراوجۆری ئەم بوونەوەرانە، دەرەنجام بیریان لە داهێنان و دروستبوونیان کردەوە، ئایا لە بنەڕەت و بنچینەدا چۆن هاتوونەتە کایەوە ؟.

لە میانەی ئەم لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەیەدا ئادەمیزاد بەچەندین قۆناغی جیاجیادا تێپەڕبوو، تەنانەت لەیەکێك لەم قۆناغانەدا بیریان لەبوونی پەروەردگارێك کردەوە، کە ئەو ئەم هەموو بوونەوەرو سروشتەی دروستکردوەو داهێناوە، بەلاّم لە ئاکامی بیرو بۆچوونی جیاوازیاندا بابزانین چ جۆرە پەروەردگارێکیان بۆخۆیان دانا:

**دەرەنجامی بیرکردنەوەکان:**

١ـ هەندێك پێیانوابوو ئەم سروشتە لەدەستکردی شتەکانی سروشت خۆیەتی، بۆیە سەردەمێك ئەستێرەیان دەکرد بە پەروەردگاری خۆیان، یان مانگ، یان ڕۆژ، سەردەمێکی دیکە ڕووناکی یان تاریکیان بە پەروەدگار دادەنا، هەندێ جار چەند دیاردەیەکی سروشتیان دەکردە پەروەردگار، یان ئاژەڵ، یان مرۆڤێك دەکرایە پەروەردگارو دەیانپەرست.

٢ـ هەندێ بۆچوونی دیکە پێیانوابوو کات واتە (زەمەن)، ئەم هەموو بوونەوەرەو گەردوونەی دروستکردوەو هێناوەتەدی.

٣ـ هەندێکی دیکە پێیانوابوو (مادده) داهێنەرو دروستکاری گەردوونە.

٤ـ بۆچوونێکی تر سەریهەڵداو هاتەکایەوە بەرەو ئەودیو سروشت ڕۆیشت، واتە بەرەو میتافیزیکی چوو، ئیدی هێنانەدی و دروستکردنی سەرجەم بوونەوەرەکانی ئەم گەردوونەی خستە پاڵ ئەوەوە.

**بۆچوونەکانی فەلسەفەیی:**

ئەگەر سەرنج بدەین و ئاوڕێك لە ڕابردوو بدەینەوە، دەبینین ئەم جۆرە دیدو بۆچوونانە دەربارەی پەروەردگاری مەزن هەمیشە لە ئارادابوە، بەردەوام زانایان و ڕووناکبیران لەم بوارەدا لە پێشبڕکێدابووینە، بۆنموونە: بۆچوونی فەلسەفی (ئەفلاتون و ئەرستۆ)، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەفلاتون لەبۆچوونەکەیدا تێکەڵاوی ئەفسانەو شتی ناشیاو هاتوە بۆیە بایەخی پێنادەین، کەواتە با بەیەکەوە سەرنج بدەینە بۆچوونی ئەرستۆ بزانین سەبارەت بە پەروەردگار ڕاو دیدو بۆچوونی چۆنە کاتێ دەڵێ:

(کورسی لەدار دروستکراوە، داریش لە درەخت هاتۆتەکایەوە، درەختیش بەرهەمی دەنکە تۆوێکە، دەنکە تۆوەکەش جووتیار چاندوویەتی، ئەم زنجیرە هۆکارە بەمجۆرە بەیەکەوە بەستراوەتەوە، بەڵگەی ئەوەن کە لەسەرەتاو دەستپێکدا

هۆکارێکی تر هەبووە ئەو هەرگیز پێویستی بە هیچ هۆکارێکی دیکە نەبووە، بزوێنەرو داهێنەری یەکەم بووە، پێویستی بە هیچ بزوێنەرێك نەبووە، دروستکارێك بووە پێویستی بەهیچ دروستکارێك نەبووە).

هەروەها کاتێ باسی ئاکارو خەسڵەتەکانی خودای مەزن دەکات دەڵێ:

(خودا هەمیشەییەو هەرهەبووە، هەردەمێنێت، لە هەموو ڕوویێکەوە بێ کەم و کوڕیە، نەسەرەتای هەیە، نەکۆتایی و نەدوایی).

بەڵام دوای ئەوە دەڵێ:

(خوا هیچ کارێکی نیە، هیچ ویست و خواستی نیە)!!.

ئەرستۆ پێیوایە کارکردن لە پێناو هێنانەدی داواییك ئەنجام دەدرێت بۆیە دەڵێ:

(خودا هیچ کارناکات، چونکە پێیوایە هیچ داواییکی نیە).

هەروەها دەڵێ:

(ویست و خواست لەئاکامی هەڵسەنگاندنی دوو شتدا دێتە کایەوە، کاتێ یەکێکیان هەڵبژێردرێت، بەڵام خودا هەموو شتە چاکەکانی لای خۆی داناوەو کۆکردۆتەوە، بۆیە هەڵبژاردن ناکات، کەواتە ویستی نیە)!.

هەروەها دەڵێ:

(هیچ کاتێك کارکردن شیاو و گونجاو نیە بۆ خودا، چونکە ئەو هەمیشەییەو هەر دەمێنێت، گۆڕانکاری بەسەردانایەت، سەرەتای نەبووە، کۆتایی نایەت، بۆیە هیچ پێویستی بەکارکردن نیە، بەڵکو ئەو زۆر بەختەوەرو شادمانە بەوە چۆن هەمیشەییەو هەر دەمێنێت، چونکە هیچ خۆشییێك ناگات بە خۆشی هەرمان، کەواتە پێویستی بەکار کردن نیە)!.

هەروەها ئەرستۆ پێیوایە ئەم بوونەوەرانە، یان چاکتر وایە بڵێین ئەم گەردوونە خودا دروستی نەکردوە چۆن دەڵێ:

(ئەم بوونەوەرانە خودا دروستی نەکردوون، چونکە خودا لە هەموو ڕوویێکەوە ئەوەندە تەواوە هیچ کەم و کوڕییێکی نیە، بۆیە پێویستی بەوە نیە خۆی سەرقاڵی دروست کردنی ماددەی هیۆڵ بکات تا ئەم شتانە دروست بکات و بێنێتەدی، بەڵکو ئەم ماددەیە لەخۆیەوە لە ئاکامی هەوڵدانی بۆ گەیشتنی بەم پڕشنگەی لەلایەن خوداوە دەڕژێتە سەری دروست دەبێت و دێتەدی، چونکە کاریگەری و کاردانەوەی هێزی بەسەرەوە هەیە، جا ئەم پڕشنگە بەرەبەرە کەم و کوڕیەکانی شتە دروستکراوەکە تەولو دەکات بەپێی شوێن و سنووری بوونەوەرەکە، بۆیە جوولەو بزووتنەوەی بوونەوەرەکە، بەپێی زۆری و کەمی ئەو پڕشنگە وهەوڵ و توانای بوونەوەرەکە خۆیەتی، کەواتە ئەمە پێیناگوترێت دروستکراوی خودا).

بۆچوونەکەی ئەرستۆ سەیرە کاتێ دەڵێ:

(خودا لە هەموو ڕوویێکەوە زۆر تەواوە هیچ کەم و کوڕی نیە).

دوایی دەڵێ:

(کارناکات و ویستی نیە).

سەرەڕای ئەمەش پێیوایە سەرجەم بوونەوەرەکانی بەرزایی ئاسمان لە ڕووناکی دروست کراون و هاتوونەتەدی، بۆیە هەمیشەیین و دەمێنن و هەرگیز لەناوناچن، چونکە پێیوابوو ڕووناکی شتێکی سادەیە، وەکو شتە ئاوێتەکان و لێکدراوەکان نیە، بۆیە هەرگیز تووشی فەوتان و لەناوچوون نایەت!.

بێگومان ئەگەر بهاتایە مەرگ بواری بە ئەرستۆ بدابوایە، تەنانەت تا ئەو کاتەی زانایان بەم دەرەنجامە گەیشتن کە ئەو ماددەیەی زەوی و ئاسمانەکانی لێ دروستبووە، هەمووی لە ڕووناکی هاتۆتەکایەوە، سەرجەم توخمەکانی ماددە لە بنەڕەت و بنچینەدا زادەی (گەردو کارەبایە)، جا ئەم گەردوو کارەبایەش لەت دەبێت و تیشك و ڕووناکی دەبەخشێت، ئەوا هەرگیز ئەو هەڵەیەی نەدەکرد کە

بەمجۆرە جیاوازی لە نێوان مان و فەوتاندا بکات، بێگومان ئەو کاتە هەرگیز ئاکاری سادەیی و ئاوێتەیی بەم شێوەیە لە یەکتری جیا نەدەکردەوە.
ڕەنگە لە دەرەنجامی ئەم بۆچوونە هەڵەیەو نادروستەی بووە نەیتوانیوە لە بێ کەموکوڕی خودا بگات و سەر لێ شێواو بووە، چونکە ئەو پێیوابووە ئەگەر خودا هەر شتێك دروست بکات، ئەوا بۆخۆی نیە بەڵکو بۆ بوونەوەرەکانی ترە، هەروەها پێیوابووە لەبەر ئەوەی خودا بۆخۆی لەهیچی کەم نیە،بۆیە زۆر لەوە مەزنترە شت بۆ بوونەوەرەکان بێنێتەدی، چونکە خۆی هیچ پێویستی بەم شتانە نیە.
کەواتە بەبۆچوونی ئەو خودا دروستکاری ئەم هەموو بوونەوەرانە نیە، هەروەها بێ ویست و خواست و بێ دەسەڵات و بێ کارە!، تەنیا زانست و زانیاری دەربارەی بەختەوەری نەمری و هەرمان هەیە، ئەم نازو خۆشیەی هەمیشەیی و نەمریەی لەسەروی هەموو خۆشییەکەو باکی بەهیچ شتێکی دیکە نیە!!!.
خوێنەری بەڕێز، ئەمەی ڕابردوو کورتەیەکە لە بۆچوونی ئەرستۆ سەبارەت بە پەروەردگاری مەزن، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین پێمولیە ئەم جۆرە بوونە بەنیمچە نەبوونێك دەژمێردرێت، هەرگیز شایان بەخودای باڵادەست و پڕ تواناو بەرزو داهێنەری گەردوون و سەرجەم بوونەوەران نیە.

**بۆچوونی تر دەربارەی پەروەردگار:**

سەرەڕای ئەم بۆچوونەی ئەرستۆ، هەندێ کەس پێیانوایە پەروەردگاری مەزن وەك بوونەوەران ئاسا دەکەوێتە ژێر باڵ و ڕکێفی (یاسای هۆکار)، واتە وەك چۆن هەر دروستکراوێك دروستکارێکی هەیە، پێیانوایە پەروەردگاری مەزنیش ئاوەها دروستکارێکی هەیە، دەڵێن چۆن ئەم گەردوون و سروشتە بەڵگەو نیشانەن کە دروستکراوێکی خودان و دیارە کەخودا دروستی کردوون، ڕەنگە بەهەمان شێوە دروستکارێکیش خودای هێنابێتەدی،(ئەی خودای پاك و بێگەرد بمانبەخشە لەم گوتنە قێزەوون و کاڵفامیە).

ئەمە بۆچوونێکی گەمژانەو سەیرە، لەسەرەتادا خودای مەزن بە دروستکار دادەنێت، پاشان ئەم ئاکارو خەسلەتەی پێ ڕەوا نابینێت، نکۆڵی دەکات و بە دروستکراوی دەزانێت، واتە خودای مەزن دەخاتە ناو بازنەی دروستکراوەکان و یاسای هۆکاریەتی،وەکو یەکێك لە بوونەوەران ودروستکراوەکانی دەژمێرێت.

ئەم جۆرە کەسانە زانست و زانیاریان لە دەوروبەری خۆیان تێپەڕناکات، کاتێ لە دەوروبەری خۆیاندا دەبینن هەموو شتێك هۆکارێك و بزوێنەرێکی هەیە، ئیتر لەمە زیاتر ناتوانن بیربکەنەوەو تێبگەن، ڕاو بۆچوونی ئەمجۆرە مرۆڤانە وەك ئەمە وایە بڵێن: یاری منداڵان چۆن بە(قورمیش) یان بە(پیل - پاتری) کار دەکات، کەواتە ئەو مرۆڤەی یاریەکەی دروستکردوە دەبێ ئەویش بە قورمیش یان بە پاتری کار بکات و بجوولێت.

خاوەنی ئەمجۆرە ڕاو بۆچوونە دیارە هەرگیز عەقڵ و ویژدانیان ناخەنەگەڕ، تا شتەکە بناسن و لەناخەوە پێی ئاشنابن و بزانن چۆنە، مێروولە ئاسا لە قوژینەکەی خۆی و دەنکە دانەوێڵەکە بەملاوە شارەزاییان لە هیچی تر نیەو سەبارەت بەم گەردوونە فراوانەو ئەم ژیانە هیچ نازانن، چۆن زانست و زانیاریان نیە.

هەمیشە لەنێوان فەیلەسوفەکان و زانایانی ئایینی سەبارەت بەناسینی خودای مەزن پێشبڕکێ لە ئارادابوە،بەڵام ئەگەر سەرنجبدەین دەبینین فەیلەسوفەکان کارەکانیان ئاسانتربوە لە زانایان بەهۆی پابەند نەبوونیان بە ئەرك و سنووری خواپەرستی، هەروەها سەرجەم بۆچوونەکانیان تیۆری بوە. بەڵام زانایانی ئایینی پابەندبوونە بەرامبەر بە ئەرك و سنووری ئایینی و خەڵکانی تری ئایین پەروەر، بۆیە هەندێ لەم فەیلەسوفانەی ئەسپی خۆیان لەم بوارەدا تاوداوە ناویان دەرکردوە،گوایە بەپێی بیرۆکەو بۆچوونی تیۆری خۆیان خودای مەزنیان زۆر بەرزو پیرۆز ناساندوەو نیشانداوە، وەك ئەرستۆ کە پێش ئێستا باسمان کرد.

## باوەڕی بەهێزو ناسینی خوادا:

ئەگەر سەرنج بدەینە باوەڕو ئایینی هەر میللەتێك یان نەتەوەیەك، دەبینین بەرزی و پیرۆزی هەرئایینێك بەندە بەناسینی خودا لەلایەن تاکەکانی نەتەوەکە، واتە ئەگەر بیرو باوەڕی نەتەوەیەك هەڵبسەنگێنین سەبارەت بەناسینیان بۆ خودا بزانین تاکەکانی چۆن خودا دەناسن، ئەو کاتە دەزانین ئەم نەتەوەیە ئایینەکەیان تا چ ئاستێك بەرزو پیرۆزە، چونکە لە میانەو لە ڕێگای ناسین و بۆ چوونیان بۆ ناسینی خودا، دەزانین ویژدان و تێگەیشتنیان بۆ چاکەو خراپە چۆنە، لەبەر ئەوەی ئایینی هیچ نەتەوەیەك لە ئاستێکی نزمدا نابێت ئەگەر نەتەوەکە باوەڕێکی تۆکمەو بەرزیان بەخودا هەبێت، هەروەها بەپێچەوانەوە ئایینی هیچ نەتەوەیەك لە ئاستێکی بەرزدا نابێت ئەگەر باوەڕی نەتەوەکە یان ناوەڕۆکی ئایینەکە بەرامبەر بەخودا نزم و دابەزیوبێت، یان بەواتایەکی دیکە ئەگەر نەتەوەیەك باوەڕێکی ڕاستەقینەو بەهێزو تۆکمەیان بەخودا هەبوو، ئەوە دیارە ئایینەکەیان بەرزو پیرۆزە، بەڵام ئەگەر نەتەوەیەك باوەڕیان بە خودا لاوازو بێهێزبوو، یان ناوەڕۆك و بەرنامەی ئایینەکەیان لە ئاستێکی نزمدا بوو، ئەوا ئەم ئایینە نزم و دابەزیو دەبێت.

## بیرو باوەڕی موسڵمانان دەربارەی پەروەردگار:

ئێستا بابزانین موسڵمانان بیرو بۆچوونیان سەبارەت بەخودای پەروەردگار چۆنە ؟، چونکە لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمان پێویستە باوەڕی ڕاستەقینەی بە خودای مەزن هەبێت، بێگومان ئەم باوەڕە پێشەنگەو لەسەروی هەموو باوەڕێکی ترەوە دێت، هەروەها هەموو باوەڕێك بەندە بە باوەڕبوون بەخودای پەروەردگاری مەزن، بیرو باوەڕی ئێمەی موسڵمان دەربارەی پەروەردگارو خودای مەزن و بەرزو باڵا بەمجۆرەیە:

خودای مەزن سەرەتاو کۆتایی نیە، هەموو بوونەوەران پێویستیان بە خودا هەیە، خودا بێ باکەو پێویستی بەکەس نیە، پەیدانەبوەو تەهاتۆتەدی فەوتانیشی نیە، هیچ شتێك لەشێوەو لە ئاستی ئەودانیە، زانست و زانیاری خودا هەموو شتێکی گرتۆتەخۆی و هەموو شتێکی داپۆشیوە، تاك و تەنیاو بێ کەسە، توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هەرچی بیەوێت یەکسەر دێتە کایەوە، ئاگاداری هەموو شتێکی شاراوەو بزرو ئاشکراو دیارە، زیندووە، دەبینێ، دەبیسێ، دەسەڵات و هێزی لەبن نەهاتووی هەیەو ..... هتد.

ئێمەی موسڵمان خوداو پەروەردگارمان بە عەقڵ و بە ویژدانەوە ناسیوە، بۆیە دەزانین تەنیا یەك تاکە خودا هەیە پێویستی بەکەس نیە، چونکە کاتێ سەیری ئەم گەردوونە دەکەین، دەبینین هەمووی لەسەر بنچینەی یەك پلان هاتۆتەدی هەمووی لەیەك ماددە هاتۆتەکایەوە، هایدرۆجین بنەڕەت و بنچینەی هەر نەوەدو دوو توخمەکەی دیکەیە، هەموو توخمەکانی تری ئەم گەردوونە فراوانە لەو پێکهاتوون، هەروەکو لەخشتەی(مەندەلیف)دا هاتووە، چۆن لە ئەنجامی ئایۆن بوون و ئاوێتەبوون و هێزی ناووکی بووەتە بنچینەی هەموویان نموونەی ئەمەش ئەستێرەکانە، هەروەها سەرجەم ئەم ژیانە لەسەر کاربۆن بنیاتنراوە، سەیرکە چۆن پاشماوەی هەر شتێك دوای سووتانی دەبێتە خەڵوز واتە(کاربۆن).

سەرەڕای ئەمە ئەگەر بێتو بۆقێك و مامزێك و نەهەنگێك و کۆترێك و مرۆڤێك و زەڕافەیەك توێکار بکەین، دەبینین هەموویان وەکو یەکترین، لەسەر بنچینەی یەك پلان دروستکراون،دەبینین هەموویان دڵیان هەیە،خوێنبەرو خوێنهێنەریان هەیە، دڵەکانیان دابەشکراوە بۆ چەند بۆشاییێك، ئێسقانەکانیان وەکو یەکە بۆ نموونە: ئێسقانی باڵەکانی کۆترەکە وەکو ئێسقانی دەستەکانی بۆقەکەیە، تەنیا جیاوازییێکی کەمیان لەنێواندا هەیە، بڕبڕەکانی ملی زەڕافەکە وێڕای درێژیەکەی ژمارەی حەوت بڕبڕەیە، واتە هێندەی ژمارەی بڕبڕەی ملی کەروێشکەکەیە،

هەرچەندە ملی کەروێشکەکە زۆر کورتە بەڵام ژمارەی بڕبڕەکانی حەوت بڕبڕەیە، هەروەها دەبینین هەموویان مێشکیان هەیە، دڕکەپەتیان هەیە، دەماری هەست و بزوێنیان هەیە، ئەندامەکانی هەرسکردن لە جەستەی هەموویان وەکو یەکتریە، هەروەها ئەندامەکانی زاوزێ کردنیش، هەموویان گورچیلەو میزەڕۆ و میزڵدانیان هەیە بۆ میزکردن، یەکەی هەرەبچووکی هەموویان لەسەری بنیاتنراون شانەیە.

سەرەڕای ئەمە دەبینین لەڕووەکیشدا بەهەمان شێوەی ئاژەڵ شانە بچووکترین یەکەیە وەکو ئادەمیزاد، هەروەها هەناسەدان و گەشەو زاوزێ و ڕێگای مردنیان لەیەکتر دەچێت.

ئایا هاوشێوەیی و بەمجۆرە لەیەکترچوونیان ، بەڵگەی ئەوە ناگەیەنن کە ئێمەی موسڵمان دەڵێین دروستکاری هەموویان یەکە؟، ئەویش پەروەردگارێکی شارەزاو داناو زۆر زاناو پڕتوانایە؟، چۆن ئەم هەموو بوونەوەرانەی ئاوا بەڕێکی و بەپلانێکی تۆکمەو بێ کەموکوڕی داهێناوە؟، چونکە بێگومان هەمیشە ئەو کەسانەی کەموکوڕیان هەیە پێویستیان بە یارمەتیدەرو کەسانێکی دیکە هەیە تا کارەکانیان بۆ تەواو بکەن، کەواتە خودایێکی ئاوا پڕتواناو زاناو بێ کەموکوڕی چ پێویستی بە یەکێکی دیکە نیە تا بێت کارەکانی بۆ تەواو بکات؟.

وێڕای ئەمەش ئەگەر خودایێکی دیکە یان زیاتر هەبوایە، دەبوایە ئەم بوونەوەرانە جیاوازیان تێدا زەق ودیارو ئاشکرابوایە، تا خودایەکەی تر لەمیانەی جیاوازیەکاندا بوونی خۆی بسەلماندبوایە، یان بە واتایەکی دیکە جیاوازیەکان ببونایە بەڵگەیەك بۆ هەبوونی ئەو.

هەروەها ئێمەی موسڵمان دەڵێین خودا هیچ هاوبەشێکی نیە، چونکە ئەم خودایە مەزنە ئاکارەکانی لەوە ناوەشێتەوە هاوبەشی هەبێت، وەك ئاکاری گەورەترین، دەسەڵاتدارترین، زاناترین....وهتد، کەواتە نابێ هیچ خودایێکی تر هەبێت جگە لە خودای مەزن و زاناو بیسەرو بینەرو لێبوردەو بەخشندەو میهرەبان.

**خودای پەروەردگار ئاگاداری سەرجەم بوونەوەرانە:**

هەروەها ئێمەی موسڵمان بەلامانەوە زۆر سەیرو نامۆیە گەر یەکێك بڵێ:

خودا یان پەروەدگار هیچ پەیوەندییەکی بە بوونەوەران نەماوە؟.

یان بڵێ :

ڕاستە ئەم گەردوونەو ئەم هەموو بوونەوەرانە پەروەدگار دروستی کردوەو دایهێناوە، بەڵام پاش ئەوەی هاتنەکایەوە ئیتر پەروەدگار پەیوەندی لەگەڵ نەماون!، (وەك بۆچوونەکەی ئەرستۆ کە لە لاپەڕەکانی ڕابردوو ئاماژەمان بۆی کردوە).

لە وەڵامی ئەمجۆرە پرسیارانەدا دەڵێین:

نازانین ئەم جۆرە کەسانە چۆن لە پەروەدگار گەیشتوون و چۆنیان ناسیوە؟!.

ئێمە لێرە پرسیارەکە ئاراستەی خۆیان دەکەینەوەو دەڵێین:

ئایا بۆ پەروەردگار کامیان شیاوترو چاکترە، پشت لەم گەردوونە بکات و هیچ ئاوڕی لێنەداتەوەو کاروباری هەڵنەسووڕێنێت و هەرگیز چاودێری نەکات، یان بە پێچەوانەوە بێت؟!.

ئایا ئەمجۆرە کەسانە پێیانوایە پەروەردگار نابیناو کەڕولاڵە، پەککەوتەو داماوە، بەهانای بوونەوەر نایەت و بایەخیان پێنادات و چاودێریان ناکات؟!.

ئێمەی موسڵمان بەباوەڕێکی زۆر بەهێزو ڕاستەقینە، بێ هیچ گومانێك دەزانین بێ ئاگاداری پەروەردگاری مەزن هیچ شتێك لەم گەردوونەدا ڕوونادات، جا ڕووداوەکە بچووکبێت یان گەورەبێت، تەنانەت ئەو هەنگەی پوورەکەی لە ناو چیاو دارو درەخت دادەنێت بە سروشی پەروەردگارە، ئەو گەڵا درەختەی کە لەکاتی هەڵوەرین و کەوتنە خوارەوەی هیچ بەهایێکی نیە، ئێمە دەڵێین پەروەردگار ئاگاداریەتی و بێ فەرمانی ئەو ناکەوێتە خوارەوە:

﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾

واتە: هیچ گەڵایەك بی ئاگادارای ئەو ناكەوێتە خوارەوە.
بێ ئاگاداری پەروەردگاری مەزن هیچ مێینەیەك بێچوەكانی،یان كۆرپەكەی،یان هێلكەكانی، هەڵناگرێت و نانێتەوە، بەروبووم و داهاتی هەموو دانەوێڵەیەك و میوەیەك و سەوزەیەك و ڕووەكێكی ئامار كردوە پێش ئەوەی بێتە بەرهەم، هەروەها ئەگەر یەكێك یان هەر بوونەوەرێك لەم گەردوونە بكەوێتە چاڵێكەوە یان بخلیسكێت پەروەردگاری مەزن ئاگادارییەتی، تەنانەت ئەگەر میكرۆبێك لە شوێنێك بڵاوبێتەوە بە ئاگاداری پەروەردگارە.
كەواتە هەموو شتێك بە ویست و خواستی ئەوە، ئەگەر ئەو حەز نەكات و نەیەوێت باران نابارێت، چەندین جار بینیومانە هەورێكی زۆر تەڕو ڕێك و گونجاو لە ئارادابوە، شنەبای شێداری پێش باران بارینیش هەڵیكردوە، كەچی یەك دڵۆپ باران نەباریوە، چونكە دیارە ویستی پەروەردگار لەگەڵ باران باریندا نەبوە بۆیە بارانەكە نەباریوە.
ڕەنگە هەندێ كەس ئەرستۆ ئاسا بڵێن جا ئەم شتە پڕوپووچانە چیە بۆ پەروەردگار تا خۆی پێیانەوە خەریك بكات؟، لەوەڵامی ئەوانەدا دەڵێین:
پەروەردگار پێویستە ئاگاداری دروستكراوەكانی خۆی بێت، كاتێ میكرۆبێك لە شوێنێك بڵاو دەبێتەوە لەوانەیە لەشكرێك بەتەواوی لەناو بەرێت، بێگومان ئەو كاتە ڕێڕەوی مێژوو بەتەواوی لە ناوچەكەدا دەگۆڕێ!، ئایا ئەمە شتێكی پڕوپووچە؟.
كۆرپەیەك كاتێ لەدایكی جیادەبێتەوە، بەڕای تۆ هیچ هێزو دەسەڵاتێكی نیە، بەڵام ڕەنگە لە ئایندەدا ببێتە دەسەڵاتدارو دڕندەو خوێن ڕێژ، ئایا پەروەردگار دەبێ لەم منداڵە بێ ئاگابێت؟، ڕەنگە كەمترین و بچووكترین شت ببێتە هۆی ڕوودانی كارەساتێكی گەورەو ئەنجامێكی سامناكی لێبكەوێتەوە، لە هەمان كاتدا ڕەنگە سامناكترین شت مایەكەی پووچ بێت و هیچ ڕووداوێك یان كارەساتێكی

لێنەکەوێتەوە، (نەمرود) ئەم پادشایە زلهێزو باڵادەستەبوو کەچی بەمێشولەیەك مردو لەناوچوو، هەروەها(ئەسکەندەری گەورە) بە مێشوولەیەك لەناوچوو مرد، ئەگەر چی لای ئێمە مێشوولە هیچ بایەخێکی نیە، کەچی سەرجەم ڕێڕەوی مێژووی جیهانی ئەوێ ڕۆژێی گۆڕی!، ئێمەی موسڵمان هیچ گومانمان لەوە نیە کە هێشتا دایکی مێشوولەکە هێلکەکەی(گەرایەکەی) لەناو ئاوی مەنگ دانەنابوو، کاتێ پەروەردگاری مەزن زانیاری و زانستی تەواوی لەسەر هەموو کون و کەلەبەری مردنی ئەم دوو کەسایەتیە هەبووە، کە دەبێ ئەم دوو کەسە بە مێشوولە بمرن، ئایا ئەمە شتێکی پڕوپووچە؟، تەنیا پەروەردگاری مەزن شارەزایی و زانستی تەواو و لەبن نەهاتوی هەیە، ئاگاداری هەموو شتێکی دیارو شاراوەیە، ئاگاداری هەموو نهێنیەکانە، تەنیا ئەو بەهای هەموو شتێك دەزانێت.

﴿عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِۖ لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٣﴾

واتە: زانایەو زانستی بەشاروەه نادیارەکان وبزرەکان هەیە تەنیا هێندەی قورسایی یەك گەردیلە لە ئاسمانەکان و زەویدا لە زانستی ئەو شاراوەو بەدەرنیە هەروەها لەمە بچووکترو گەورەتریش هەمووی نووسراوەتەوەو تۆمارکراوە.

لەوانەیە لێرە هەندێ کەس ئەمجۆرە پرسیارانەیان لە مێشك و دەروونیدا گەڵاڵە بێت و بڵێن:

**- کەواتە ئێمە تاوانمان چیە کاتێ تاوانێك ئەنجام دەدەین؟.**

**- پەروەردگار کە ئاگاداری هەموو کارو ڕەفتارو بیرو بۆچوونەکانمانە بۆچی قەدەغەمان ناکات و بوارمان دەدات و دەرفەتمان بۆ دەڕەخسێنێت تا کارو کردەوەی خراپ ئەنجام بدەین ؟.**

ـ کەواتە ئێمە بەدەست خۆمان نیە کاری چاکە هەڵبژێرین بەڵکو بۆمان داندراوە پلانێکە و ناتوانین سەرپێچی بکەین؟.

ـ کەواتە بۆچی لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت؟.

ئەگەر لە وەڵامدا بەمجۆرە کەسانە بڵێین:

ئێوە هەمیشە سەربەست و ئازادن لە هەڵبژاردنی کارو ڕەفتارەکانتان، هەروەها ئێوە ویست و خواستتان هەیە، ئەوەی بتانەوێت دەتوانن بیکەن و ئەنجامی بدەن، هەروەها ئەوەی نەتانەوێت دەتوانن نەیکەن و ئەنجامی نەدەن.

ڕەنگە بڵێن ئێمە کوا سەربەستین؟!، ئایا سەربەست و ئازادین لە هەڵبژاردنی ڕەگەزی خۆمان؟، یان لە درێژی و کورتی بەژن و بالأمان؟، یان لە ڕەنگمان؟، یان لە هەڵبژاردنی خاك و نیشتمانمان؟، یان لە مێژووی لەدایکبونمان؟، لەچی سەربەستین چیمان پێدەکرێت؟.

هەروەها دەڵێن چۆن دەبێ ویست و خواستمان هەبێت؟، چۆن ویست و خواست تەنیا بۆ خودایە، ئەمە زیادە ڕۆییەو تاوانە، نابێ ئێمە ویست و خواستمان هەبێت.

کەواتە پرسیارەکەیان لە دوو تەوەردا خۆی دەنوێنێ:

تەوەری سەربەستی.

تەوەری ویست و خواست.

**سەبارەت بەتەوەری سەربەستی دەڵێین:**

ئێمەی موسڵمان گومانمان نیەو دەزانین پەروەردگاری مەزن هەموو ڕەفتارو کردەوەکانمان دەزانێت و لای ئەو نوسراوەتەوە، بەڵام هەرگیز بەزۆری و زۆرداری بەسەرماندا نەیسەپاندوە تا ئێمە بیکەین و ئەنجامی بدەین، بەڵکو تەنیا لە زانست و زانیاری پەروەردگاری مەزندا هاتوە و دەزانێت هەریەکێك لە ئێمە چی دەکات، بۆنمونە:

ئەگەر تۆ لەگەڵ چەند برایێکت لەماڵەوە بەیەکەوە بژین، زوو بزانیت یەکێك لەم برایانەت لە داهاتوودا دزی دەکات، هەوڵ بدەیت و ئامۆژگاری بکەیت کە دزی کارێك و ڕەوشتێکی قێزەوون و تاوانە، پاشان بەڕاستی ئەو برایەت کاری دزی ئەنجام بدات، ئایا تۆ بەزۆرو زۆرداری ئەم برایەت تووشی دزیکردن کردوە؟!.

یان ئەگەر مامۆستایەك لە سەرەتای ساڵی خوێندن لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنی ئاستی قوتابیان، بزانێت یەکێك لە قوتابیەکان ئەم ساڵە سەرکەوتو نابێت، ئایا کاتێ قوتابیەکە لە کۆتایی ساڵدا سەرکەوتو نەبوو، تاوانی مامۆستاکە چیە؟، ئایا ستەمی لێیکردوە؟.

بێگومان لەوەڵامی هەردوو نموونەکەی ڕابردوو دەڵێین: نەخێر نە برایەکەو نە مامۆستاکە تاوانیان نیە،بەڵکو تەنیا برا دزەکەو قوتابیە سەرنەکەوتوەکە تاوانبارو کەمتەرخەم بوون، چونکە پابەندی ئامۆژگاریەکان و ڕێنماییەکان نەبوون.

هەروەها سەبارەت بەم سەربەستیەو ئازادیەی باسی دەکەن، دەتوانین بڵێین ئەمە سەربەستییەکی بێ سنوورە، بەهیچ دابونەریت و یاساییێك و بەرنامەیەکی ژیان نەبەستراوەتەوە، واتە سەربەستییەکی بەرهەڵدراوە یان(بەرەڵایە)، چونکە ئەوەی ئەمجۆرە کەسانە دەیانەوێت، تەنیا خودای مەزن دەتوانێت بیهێنێتەدی و بەئەنجامیان بگەیەنێت، بێگومان خودای پەروەردگار هیچ هاویەشێکی پێویست نیەو کەس شارەزایی لە داهێنانەکانی ئەودا نیە، بەڵکو خودای مەزن و باڵادەست چی بیەوێت دەیکات.

سەرەڕای ئەمەش خودای پڕتوانا لە دوا ڕۆژدا لێپرسینەوەمان لەسەر ئەوە لەگەڵ ناکات کە بۆچی من کورتە باڵام یان تۆ بۆ باڵا بەرزی؟، هەرگیز لێپرسینەوەمان لەگەڵ ناکات و ئازارمان نادات سەبارەت بەوەی کە بۆچی هەوڵمان نەداوە شاری هەولێر لەسەر لێواری دەریابێت؟.

بەڵکو ئەوەی لێپرسینەوەمان دەربارەیان دەکرێت، بریتیە لەم کارو کردەوانەی داوامان لێکراوەو فەرمانمان پێکراوە بیکەین، یان لێمان قەدەغە کراوەو فەرمانمان پێکراوە نەیکەین، ئێمەش لەم بوارەدا سەربەستین و ئازادین ئەگەر بمانەوێت کارەکان بکەین یان نەیانکەین، ئەوەیە مەبەستی ئێمە کاتێ دەڵێین ئێمە سەربەستین لە هەڵبژاردنی کارو کردەوەو ڕەفتارەکانمان، کەواتە تۆ ئازادو سەربەستی لەدامرکاندنی حەزو ئارەزوەکانت،تۆ سەربەستی ڕقوقینەت نەدرکێنی، تۆ ئازادی ڕاستگۆبیت یان درۆبکەیت،دەتوانی(حەرام) بخۆیت یان(حەلال) بخۆیت، تۆ ئازادی دەتوانی زمانت لەقسەو گوفتاری چاك و سوودبەخش بەکاربێنی، یان لە دووزمانی و ئاژاوەنانەوەو باسی ئەم و ئەو بەکاری بێنی، بۆ نموونە:

ئەگەر چاکترین و نایابترین جۆری ئۆتۆمۆبێل، لە ناودارترین کۆمپانیای جیهاندا تازە دەرچووبێت هیچ بەکار نەهاتبێت، بیهێنن لە ڕێگایەکی شاخاویدا دایبنێن، بەیەکێك بڵێن ئەم ئۆتۆمۆبێلە لێخوڕە، ئەگەر بێتو شوفێرەکە لە خێراییێکی ڕادەبەدەردا ئۆتۆمۆبێلەکە لێبخوڕێت، چۆن خێراییەکەی ١٥٠-٢٠٠ کیلۆمەتر بێت لە کاتژمێرێکدا، ئایا کاتێ لە پێچوپلوچی ڕێگا شاخاویەکەدا هەر کارەساتێك و ڕووداوێك ڕوویدات کۆمپانیاکە چ پەیوەندییێکی هەیە بە هەڵەو تاوانی شوفێرەکەوە؟، بەڵێ ڕاستە کۆمپانیەکە خێرایی زۆری داناوە بۆ ئۆتۆمۆبێلەکە، بەڵام وێڕای ئەمەش شوفێرەکە ڕێنمایی و ڕابەرێتی کراوە، تەنانەت ڕادەی خێراییەکەی لەسەر شەقامەکە بۆ دیارکراوە، کەواتە شوفێرەکە خۆی تاوانبارە، چونکە پابەند نەبوە بە ڕێنماییەکان، خۆی بەسەربەست زانیوە، پابەندی جێبەجێ کردنی یاساکان و ڕێنماییەکان نەبووە.

ئەنجامدانی کارو کردەوەی چاك شتێکی ڕەمەکی و خۆڕسکە لەناو خودو دڵ و دەروونی ئادەمیزادا، ئەگەر سەرنجبدەین دەبینین هەریەکێك لە ئێمە کاتێ کارێکی ناڕەوا ئەنجام دەدات زۆر نیگەران و دڵپەست دەبێت، هەست بە لێپرسینەوە

دەكات، پەشیمان دەبێتەوە لەم هەڵەیەی كردوویەتی، بەهەمان شێوە كاتێ یەكێك كارێكی چاك ئەنجام دەدات، هەست بەدڵخۆشی و شادی و بەختەوەری و دەكات، كەواتە دیارە لەناخەوە حەز دەكەین كارو كردەوەی چاك و سوودبەخش بكەین و ئەنجامبدەین، وێڕای ئەمەش هەمیشە مێشك و بیرو دەروونمان بۆلای كردەوە چاكەكان سەركێشمان دەكەن و لە هەڵبژاردن و هەڵسەنگاندنی كاری پوخت و چاك و سوودبەخشدان.

كەواتە ئەگەر لە دڵ و دەروونەوە بە كارو كردەوەیەك قایل نەبین و نەمانەوێت ئەنجامی بدەین، ئەوا كارەكە ئەنجام نادەین، جا ئەو دڵە لەژێر هەر فشارێك بێت ، بۆ نموونە:

تۆ دەتوانیت بە هەر جۆرێك بێت ئەسپێك ببەیتە ناو كانیاوێك، بەڵام هەرگیز ناتوانیت بەزۆر ئاوەكەی پێ بخۆیتەوە.

مەبەستمان ئەوەیە خودای مەزن و باڵادەست، دڵەكانی ئێمەی لە هەموو جۆرە فشارێك و بەزۆر سەپاندنێك دوور خستۆتەوەو سەربەست و ئازادی كردوە، بۆیە ئەگەر دڵەكانمان حەز لە كارێك نەكات و ئارەزووی نەكات هەرگیز كارەكە ئەنجام نادەین، چونكە دڵ بە ڕەمەكی(فطري)ئازادو سەربەستە، بۆیە پەروەردگاری مەزن دڵەكانی ئێمەی كردۆتە سەنگی مەحەك:

﴿ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾

واتە: ئەو ڕۆژەی هیچ شتێك سوودی نیە لەڕۆژی دواییدا، تەنیا ئەو كەسە نەبێت كە بەدڵێكی ساغ و دروست دێتەلای خودای مەزن.(واتە دڵێكی خودا پەرستەو كردەوەی چاكی ئەنجامداوە).

سەیركە بزانە ئەگەر یەكێك لە ژێر فشاری هەڕەشەو ئازارو ئەشكەنجەدا هاوبەش بۆ خودا دابنێت، كە ئەم تاوانە لە هەموو تاوانێك گەورەترەو بێ وێنەیە، بەڵام لە دڵدا و لە ناخەوە ئەم نیازەو ئەم مەبەستەی نەبووبێت، واتە دڵەكەی باوەڕێكی

تۆکمەو نەگۆڕو چەسپاوی تێدا سرەوتبوو، ئەوا بەتاوانبار دانانرێت، هەروەکو پەروەردگاری مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ ﴾

واتە :ئەوەی پاشگەزبێتەوە لە خودا ناسین دوای باوەڕهێنان، جگە لەوانەی بە زۆر وشەی(کوفر) بەزمانیاندادێت ودڵیان بەباوەڕ سرەوتوەو تۆقرەی گرتوە.

**تەوەری ویست و خواست:**

بەڵام سەبارەت بەتەوەری ویست و خواست، گوتمان هەندێ کەس پێیان وایە ئەگەر بڵێین ئێمەی مرۆڤ (ویست وخواستمان) هەیە ئەوە تاوانەو زیادەڕۆییە دەیکەین. دەڵێین ئازادی و سەربەستی ئادەمیزاد هەرگیز بۆی نیە لەسەرووی ویستی پەروەردگار بێت، ئادەمیزاد بۆی هەیەو دەتوانێت لە میانەی ئەو ئازادیەی هەیەتی سەرپێچی لە فەرمانەکانی خوادا بکات، بەڵام هەرگیز بۆی نیەو ناتوانێت کارێك ئەنجام بدات دژی ویستی خودا بێت، کەواتە هەر کارێکی ئێمە دەیکەین لەناو بازنەی ویستی خوادایە، تەنانەت سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوداش بێت، چونکە ئازادی و سەربەستی بەخششی پەروەردگارە بۆ ئادەمیزاد، کەواتە ئەم ئازادیەش ویستی خودایە، هەروەکو فەرموویەتی:

﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾

واتە: دڵنیابن کەوا ئێوە هیچتان پێناکرێت هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت، هیچتان ناوێ تەنیا مەگەر خودا ویستی لەسەربێت.

کەواتە ویستی ئێمە لەگەڵ ویستی ئەودایە، پەروەردگاری مەزن ئەم ویستەی داوە بە ئێمە، لەژێر چاودێری خۆی دایناوە بێ ململانێ و بێ دژایەتی کردن، بەڵام ئەو سەربەستیەو ئازادیەی داویە بە ئێمە، مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە ململانێی ویستی خودای پێدەکەین، بەڵکو هەمیشە لەژێر فەرمان و حوکمی پەروەردگار

داین، چونکە خودای مەزن و بەزەیی بەپێی نیازو ویستی دڵ و دەروونی مرۆڤەکە بڕیاری بۆ دەدات، ویستی خودا لەگەڵ نیازی کەسەکە یەك دەگرێتەوە واتە پەروەردگاری مەزن هەریەکەو بەپێی نیازو ئاوات و ئارەزووی دڵی کەسەکە کارەکەی بۆ فەراهەم دەکات و دەڕەخسێنێ، کەواتە کەس فشاری لەسەر نیە بۆ ئەنجامدانی کارو کردەوەکانی، ئینجا کارەکە چاك بێت یان بەد بێت، هەروەکو فەرموویەتی:

﴿ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَـٰقُهُمْ لَهَا خَـٰضِعِينَ ﴾

واتە:ئەگەر بمانەوێت لە ئاسمانەوە بەڵگەیەك (موعجیزەیەکیان) بۆ دادەبەزێنین ئەوسا هەمیشە گەردنیان بۆی دادەنەوێنن و مل کەچ دەبن بۆی.

کەواتە پەروەردگار بەزۆر کەس ناکاتە موسڵمان، بۆیە ئەم جۆرە بەڵگەیە لە ئاسمانەوە دانابەزێنێت، بەڵکو هەر مرۆڤێك سەربەست و ئازادە ئەگەر ببێتە موسڵمان یان نەبێتە موسڵمان.

هەروەکو فەرموویەتی:

﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ ﴾

واتە:ئایین و باوەڕهێنان بە ناخۆشی و بەزۆر ناکرێت و بەسەر کەس ناسەپێت، چونکە ڕێبازی چاك ودروست ئاشکرابوەو جیابۆتەوە لەگومڕایی و سەرکەشی.

هەروەها پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ﴾

واتە:ئەوەی بەرهەمی دوارۆژی دەوێ ئێمە پاداشتی بە زیادەوە پێدەبەخشین وە ئەوەی بەرهەمی ئەم ژیانەو جیهانەی دەوێ ئەوا پێیدەدەین.

کەواتە هەریەکێك بەپێی نیازو ئارەزووی خۆیەتی، تەنیا ویستی خودا کارەکەی بەپێی نیازو دڵی ئەو بۆ فەراهەم دەکات و دەڕەخسێنێ.

هەروەها پەروەردگاری مەزن سەبارەت بە هەندێ دیل دەفەرمووێت:

﴿إِن يَعْلَمِ ٱللَّهُ فِى قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمْ﴾

واتە:ئەگەر خودا چاکە لە دڵەکانتان بەدی بکات و بزانێ چاکەیان تێدایە زۆر لەوە چاکترتان پێ دەبەخشێت کە لێتان سەندراوە.

هەموو ئەو کارو کردەوەو ڕەفتارو گوفتارانەی ئەنجامی دەدەین پەیوەستە بە ڕازو نیازی ناو دڵەکانمان، ئەوەی خودا بۆی نووسیوین و بۆمان دەیهێنێتەدی لەگەڵ ئەو نیازو مەبەستانەمان یەك دەگرێتەوە، کەواتە دوو بۆچوون و دوو مەبەستی لەکتر جیاوازنین بۆ ئەنجامدانی کردارەکانمان، بەڵکو هەردووکیان یەك دەگرنەوەو دژایەتی یەکتری ناکەن، کاتێ بەئارەزووی خۆمان نیازو ڕازمان لەسەر ئەنجامدانی کارێکە، پەروەردگاری باڵادەست هەموو ڕێچکەکانی گەیشتن و جێبەجێ کردنی کارەکەمان بۆ فەراهەم دەکات و ڕێکدەخات، ئینجا کارەکە چاك بێت یان بەدو نالەباربێت.

**ئازادی و سەربەستی پەیوەستە بە ئاستی زانستی مرۆڤەوە:**

ئازادی و سەربەستی ئادەمیزاد بەپێی ڕێژەی زانست و زانیاری مرۆڤ دەگۆڕێت، واتە توانایێکی ڕێژەییە بەپێی ئاستی زانستی مرۆڤ زیاد و کەم دەکات، دەبینین ئەمڕۆ بە نۆزینەوەو داهێنانی ئامێرو کەلوپەلی پەیوەندی کردن و گەیاندن، مرۆڤ توانیویەتی مەوداکان کەم بکاتەوە لەئاکامدا زەوی بچووك بکاتەوە، وێڕای ئەوەش لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا هەنگاوی زانستی زۆر پێشکەوتوو هاتۆتەدی، بەم پێشکەوتنە زانستیانە مرۆڤ سەربەستی زیاتری بۆخۆی بەدەست هێناوە، کەواتە هەرچەند زانست پێشبکەوێت ئەوەندە سەربەستی مرۆڤ زیاتر دەبێت، بۆیە

دەبینین شۆڕەسواری گۆڕەپانی فەلسەفە مامۆستاو زاناو داناو بلیمەت(ئەبو حامیدی غەزالی) دەڵێ:

ئادەمیزاد ئەو شتەی زانست و زانیاری دەربارەی هەیە، تیایدا سەربەستەو بە هەوەسی خۆیەتی ئەگەر بیکات یان نەیکات، بەڵام ئەوەی زانیاری دەربارەی نیە دەبێ بیکات بۆی نیە نکوڵی و سەرپێچی بکات.

کەواتە هەرچەند زانست و زانیاریمان پەرەبسەنێت سەربەستی و ئازادیمان پتر دەبێت.

**مرۆڤ بێ هەڵە نابێت:**

ئاشکراو ڕوونە پەروەردگاری مەزن و زۆر داناو زاناو پڕتوانا ویستوویەتی ئێمەی ئادەمیزاد ئازادو سەربەستبین لە هەڵبژاردنی ڕێچکەی ژیانمان و بەسەربەستی بژین، ئەمەش لەمیانەی ئەنجامدانی کارو ڕەفتاری هەڵە و تاوان و ناڕەواو نالەباردا خۆی دەنوێنێت، چونکە سەربەستی وئازادی هیچ تام و چێژو ڕەنگدانەوەی نابێت لە ژیانی ڕۆژانەماندا ئەگەر هەڵە کردن و ڕاستکردنەوەی تێدا نەبێت، ئەگەر مرۆڤ بۆخۆی بە سەربەستی و ئازادی ڕێگایێك هەڵنەبژێرێت، ئینجا ڕێگاکە چەوت و هەڵە بێت یان ڕاست و دروست بێت بۆچی ئازادە؟!، بێگومان پەروەردگاری مەزن لە توانایدابوو هەمووومان مل کەچ بکات بۆ خوداپەرستی و ئەنجامدانی کاری ڕەواو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خۆی، بەڵام ئەو کاتە ئێمەی ئادەمیزاد بۆ سەربەست و ئازاد بووین؟!، سەرەڕای ئەمە ئەگەر مرۆڤێك لە ژیاندا هەڵە بکات و پەشیمان بێتەوە، هەمیشە بەدەم ئازاری هەڵەکانی بتلێتەوەو خۆی بەشەرمەزارو تاوانبار بزانێت، چونکە پەروەردگار ئێمەی بۆ ئەوە دروستکردوە لە ژیاندا هەڵە بکەین و پاشان پەشیمان بینەوەو هەمیشە خەفەت بۆ هەڵەو تاوانەکان بخۆین.

ئەگەر بە ویژدانەوە سەیریکەین و سەرنج بدەین دەبینین کردەوەو ڕەفتاری چاك ڕێساو بنچینەیە لەژیانی مرۆڤدا،بەڵام کردەوەو ڕەفتاری ناڕێك وتاوان و خراپەکاری

کارێکی لاوەکیە، هەروەکو چۆن لەش ساغی و تەندروستی بۆ ئادەمیزاد ڕێساو بنچینەی ژیانە، کەچی دەردو نەخۆشی دۆخێکی لاوەکی و کاتیە، ئیتر بەهەمان شێوە کاری چاکەش هەمیشەییە و خراپەکاری کاتیە، چۆن دەبینین لە ژیاندا زۆربەی هەرەزۆری تەمەنمان بەخۆشی و دوور لەنەخۆشی دەبەینە سەر، تەنیا چەند ڕۆژێکی کەم نەخۆش دەکەوین، هەڵەو تاوانیش بەهەمان شێوەیە بۆ ئادەمیزاد.

ئینجا چۆن نەخۆشی بەرگری دژی میکرۆبەکان لەناو لاشەمان دەنێتەوەو پەیدا دەکات، چۆن ئێش و ژان وورەو خۆڕاگریمان تێدا بەهێز دەکات، بەهەمان شێوە پێویستە لەسەرمان هەڵەکردن وئەنجامدانی تاوانیش ئاوا ڕێگای ڕاست و دروستمان بۆ دابین بکات، گڕوتینی خواپەرستیمان تێدا برەو پێ بدات تا دووبارە هەڵەو تاوان ئەنجام نەدەینەوە.

لەلایەکی دیکە هەڵەکردن و ئەنجامدانی تاوان وەك سێبەری وێنەیە، چۆن کاتێ لە تابلۆیەك نزیك بکەوینەوە ئەو سێبەرەی بۆ وێنەکە دروستکراوە بەناشیرینی دێتە بەرچاومان، بەڵام کاتێ لەدوورەوە بەچاوێکی فراوان و لە هەموو ڕوێکەوە سەیری وێنەکە بکەین، ئەوکاتە بۆمان دەردەکەوێت چۆن سێبەرەکە تەواوکەری وێنەکەیە، بگرە زۆر پێویستە وێنە سێبەری بۆ دروست بکرێت، چونکە بێ سێبەر وێنە جوانی خۆی نابەخشێت و دەرناکەوێت.

هەروەها ئەگەر نەخۆشی نەبوایە ئێمەی مرۆڤ هەرگیز نەماندەزانی تام و چێژی تەندروستی چیە، هەروەها ئەگەر ناشیرینی نەبوایە هەرگیز نەماندەزانی جوانی مانای چیە، هەروەکو فەیلەسوف و زانای بلیمەت و پایەبەرز (غەزالی) دەڵێ:

کەموکوڕی گەردوون تەواوکەریەتی، وەکو چەماوەیی کەوان، چۆن کەوان هەمیشە دەبێ چەماوە بێت، ئەگەر بێتو کەوان ڕاست بکەینەوە کەلکی تیر هاوێشتنی

نامێنێت، بۆیە پێویستە کەوان هەمیشە چەماوە بێت، ئەگەر چەماوە نەبوو دیارە ناتەواوە.

جگە لەمە ئەگەر ڕەفتارو کردەوەی نابەجێ و هەڵەکردن نەبوایە، چۆن مرۆڤی چاك و ڕەوشت بەرز دەهاتە کایەوە، چونکە ئەوکاتە هەموو خەڵك لە یەکتری دەچوون و جیاوازی لەنێوانیاندا نەدەما، ژیانیش هیچ بایەخێکی نەدەما، چۆن ئەم ژیانە لەسەرەتای هاتنە کایەی واتە لەو ڕۆژەی ئادەم(سڵاوی خوای لێبێت) دروست کراوە تا ڕۆژی دوایی بریتیە لە تاقیگەی سەرجەم ئادەمیزاد، پێویستە هەر تاکێك پلەو پایەی خۆی لەم تاقیگەیەدا بەدەست بێنێ، چونکە ئەم ژیانەی ئێستامان بەشێکە لە ڕۆمانێك، مردنیش کۆتایی ڕۆمانەکە نیە، بەڵکو سەرەتاو دەسپێکی ڕۆمانەکەیە.

**خودا بەچاو دیارنیە:**

سەرەڕای هەموو ئەوەی ڕابردوو، هەندێ کەس باوەڕیان بەبوونی خودای مەزن لاوازو بێهێزە(پاك و بێگەردی و بەرزی و میهرەبانی هەربۆئەویە پەروەردگاری مەزن بمانبووره)، یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی ئەم بێ باوەڕیە لە لایەن ئەمجۆرە کەسانە بۆ دیار نەبوونی خودای مەزن دەگەڕێتەوە، واتە چونکە خودا بەچاو نابینرێت، بەڵام پێویستە وێڕای ئەمجۆرە کەسانە هەموومان ئەوە بزانین یەکێك لە هۆکارە هەرە گرنگەکان و پێویستیەکانی باوەڕبوون بە خودای مەزن ئەوەیە نابێ دیاربێت و هەرگیز نابێ بەچاو ببینرێت، چونکە ئەگەر شتێك دیارو ئاشکرابوو، واتە هەموو کەس بتوانن بەچاو بیبینن، ئیتر چ پێویست بەمە دەکات باوەڕ بەبوونی ئەم شتە بکەین؟!، ئەو کاتە ئەگەر یەکێك باوەڕ بەشتە دیارەکە نەکات دیارە ئەو کەسە کاڵفامە، یان هۆشی نەماوە(شێتە).

بۆیە پێویستە لەڕێگای عەقڵ وبیرو هۆشەوە باوەڕمان بە پەروەردگاری باڵاو مەزن هەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش بەڵگەکانی سەلماندنی بوونی خودای مەزن یەکجار

زۆره، له لاشه‌ی مرۆڤه‌وه بگره تا ده‌گاته به‌رزایی ئاسمانه‌كان به هه‌زاران به‌ڵگه‌ی ڕوون و ئاشكرا له ئارادان، بۆ نموونه:

ئه‌گه‌ر به ووردی سه‌رنج بده‌ین بۆ سه‌ره‌تای دروستبوون و هاتنه‌كایه‌ی ئه‌م گه‌ردوونه، ئایا چۆن له سه‌ره‌تاوه هاتۆته‌دی و دروست بووه، ئه‌و كاته بۆمان ڕوون ده‌بێته‌وه په‌روه‌ردگارێكی زۆر به‌هێزو یه‌كجار به تواناو زۆر زاناو دانا هێناویه‌ته‌دی، هه‌میشه هێنانه‌دی و هێنانه‌كاو دروستكردن شایان به‌ئه‌وه، ئیدی ئه‌وكاته باوه‌ڕی تۆكمه‌و ڕاسته‌قینه‌مان له دڵ و ده‌رووندا ده‌چه‌سپێت، بۆیه پێویسته زۆر به‌ووردی سه‌رنج بده‌ینه ئه‌م بابه‌ته فیزیاییه سه‌باره‌ت به دروستبوونی ئه‌م گه‌ردوونه فراوانه، بابه‌ته‌كه ئه‌ندێشه‌یه‌كی شیعر نیه، زانستیه دووره له ئه‌فسانه، بۆیه هیچ كه‌سێك بۆی نیه نكوڵی له ڕاستی و دروستی ئه‌م بابه‌ته بكات، چونكه بێگومان بابه‌تی زانستی له ئه‌نجامی چه‌ندین لێكۆڵینه‌وه‌و توێژینه‌وه‌و تاقیكردنه‌وه دێته كایه‌وه هه‌رگیز هیچ گومانی تێدا نامێنێت بۆیه ناكرێت نكوڵی لێبكرێت.

زانایانی بواری زانستی فیزیای گه‌ردوون له وڵاتانی ڕۆژئاوادا وه‌ك(جۆرج جامۆ) و هاوه‌ڵه‌كانی، ده‌ڵێن:

پله‌ی گه‌رمی له‌سه‌ره‌تای هاتنه‌كاو دروستبوونی گه‌ردوون گه‌یشتۆته ڕاده‌یه‌كی بێ سنوور، بریتیبووه له (یه‌ك ترلیۆن) پله‌ی سه‌دی، وێڕای ئه‌م گه‌رمیه زۆره پاڵه‌په‌ستۆكه‌ی گه‌یشتۆته نزیكه‌ی ترلیۆنێك كیلۆمه‌تر، كه‌واته له‌م پله گه‌رمیه به‌رزه‌دا پرۆتۆن و نیۆترۆن ده‌رفه‌تی دروستبوونیان بۆ نه‌ڕه‌خساوه، كه‌واته مادده له‌ئارادا نه‌بوه، به‌ڵكو بگره هیچ بنه‌مایێكی نه‌بوه،ئیتر له‌ئه‌نجامی به‌رزبوونه‌وه‌ی پله‌ی گه‌رمی و پاڵه‌په‌ستۆكه بۆ ئه‌م ئاسته به‌رزه، له‌ناكاو ته‌قینه‌وه‌یه‌ك ڕوویدا.

ئەم تەقینەوەیە لەناو زانایان و فیزیاناساندا بە(تەقینەوەی مەزن) ناسراوەو ناو دەبرێت، ئەو ماوەیەی تەقینەوەکە خایاندویەتی زانایانی فیزیك دەڵێن بریتیبوە لە ـ١ـ چرکە واتە (یەك چرکە دابەش دە توان سی و دوو).
$١٠^{٣٢}$

ئیتر ئەم گەردوونە فراوانە لەم ماوەیە کورتەدا ئاوا بەرێکی پلانی بۆ دارێژرابوو بێ هیچ کەموکورییێك دروستکراو هاتەدی.

لێرە دەڵێین بۆ ئەم تەقینەوەیە مەزن و لەپڕو لەناکاوە دوو بۆچوون هەیە:

یەکەم: تەقینەوەکە لەناو خودی تەقێنراوەکە واتە(بنچینەی گەردوون)دا خۆی ڕوویداوە، بێ کاریگەری هێزێکی دەرەکی.

دووەم: لەهێزێکی دەرەوەدا بەسەریدا سەپاوە، لەخودی خۆیدا نەبووە.

بابزانین زانستی فیزیای گەردوون سەبارەت بەم دوو بۆچوونە وەڵامی چیە؟:

زانستی فیزیای گەردوون دەڵێ:

گریمان تەقینەوەکە لەناو خودی بنچینەی گەردوون بەهۆی مەشخەڵێکی نزمتر لەگەرد ڕوویداوە، بەڵام هەرچۆنی بێت خێرایی مەشخەڵەکە لە (٣٠٠٠٠٠) سێسەد هەزار کیلۆمەتر زیاتر نابێت لە یەك چرکەدا، کە ئەمەش بریتیە لە خێرایی ڕووناکی، لەبەر ئەوەی زانایانی فیزیا گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامە کە هەرشتێك خێراییەکەی لە خێرایی ڕووناکی واتە لە (٣٠٠٠٠٠) سێسەد هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا تێپەڕ بکات، ئەوا قەبارەکەی ئەوەندە فراوان دەبێت و لێکدەچێت ئیتر بەرەو فەوتان و نەمان دەڕوات، کەواتە ئەگەر تەقینەوەکە لەناو خودو ناخی بنچینەی گەردووندا ڕوویدابێت، ئەوا بێگومان نەیتوانیوە لەیەك چرکەدا مەودای نزیکەی ترلیۆنێك کیلۆمەتر ببڕێت، جا چجای ئەوەی کە ماوەی تەقینەوەکە کەمتر بووە لە یەك چرکە، چۆن بریتیبووە لە یەك چرکە دابەش دە توان سی و دوو!،

بۆیە زانایانی بواری زانستی فیزیای گەردوون نکوڵی لە بۆچوونی یەکەم دەکەن و دەڵێن: هەرگیز تەقینەوەکە لەناو خودی تەقێنراوەکە خۆی ڕوویندەداوە.

کەواتە بۆچوونی دووەم پشتڕاست و پەسند دەکرێت، تەقینەوەکە لە هێزێکی دەرەکی باڵادەستەوە بووەو بەسەر بنچینەی گەردووندا سەپاوە، بەڵام ئەم هێزە باڵادەستە زۆر بلیمەت و زانابووە، لەهەموو بوارێکدا شارەزاییێکی تەواو و بێ کەموکوڕی هەبووە، بۆیە هەموو بوونەوەرێکی ئەم گەردوونە زۆر بەڕێکی هاتەکایەوە، هەمووی پلانی تایبەتی و گشتی بۆ داڕێژراوەو هاتۆتەدی تا کاتی دیاری کراوی خۆی.

ئیتر ئەم بابەتەی زانستی فیزیك، هیچ دەرفەت و بواری نەهێشتۆتەوە بۆ ئەو بۆچوونانەی پێیانوایە ئەم گەردوونە هەمیشەییەو سەرەتاو کۆتایی نیە ونافەوتێت، چونکە سەرەتای دروستبوون و هاتنەکایەی بەپێی زانستی فیزیای گەردوونی سەلمێندراوەو بوەتە شتێکی بەڵگەنەویست بەتایبەتی لەناو زانایان و گەردوون ناساندا، کەواتە بەهەمان شێوە فەوتان و نەمان و لەناوچوونیشی تا ئەو کاتەی بۆی دیار کراوە کارێکی بەڵگەنەویستە.

دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە زانستیە ڕاستەقینەیە ئەگەر یەکێك باوەڕی بە پەروەردگار بێ هێزبێت، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە دیارە ئەو کەسە ئاستی زانست و زانیاری لە پلەیەکی زۆر نزمدایە، بۆیە بۆی نیە بەم ئاستە نزمەی لەبابەتی زانستی بگات، چونکە بێگومان ئەگەر یەکێك زانست و زانیارییێکی کەمی هەبوو، هەمیشە تێگەیشتن و بۆچوونیشی بۆ بابەتی زانستی کەم دەبێتەوە، ئەمجۆرە کەسەی برە زانستێکی کەمی هەبێت تەنیا سەبارەت بە بوونەوەرەکانی دەوروبەری تۆزێك زانیاری لا گەڵاڵە دەبێت، بەڵام توانای ئەوەی نیە سەبارەت بەم

شتانەی بەچاو نابینرێن باوەڕ بکات و تێیبگات[1]، بەڵام هەروەکو لە لاپەڕەکانی ڕابردوودا ئاماژەمان بۆ کردو گوتمان، یەکێك لە هۆکارەکانی دیارنەبوونی پەروەردگار دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە پێویستە مرۆڤ باوەڕی بە شتێکی شاراوەو نادیار هەبێت، ئەگەر هاتوو شتێك دیاربوو چ بایەخێك و گرنگییەکی نامێنێت ئایا باوەڕ بە بوونی دەکەیت یان باوەڕی پێناکەیت، چونکە ئەگەر نکۆڵی لە بوونی بکەیت و شتەکەش دیاربێت و بەچاو ببینرێت، ئەوکاتە دیارە لەبەر هۆکارێك و نیازێکی تایبەتی خۆت، یان لەبەر کەللە ڕەقی، یان مێشك و عەقڵت تەواو نیە، بۆیە باوەڕ بە بوونی شتە دیارەکە ناکەیت.

سەرەڕای ئەمە نابێ بەهیچ شێوەیەك بیر لەوە بکەینەوە کە ئایا خودا شێوەو ڕوخساری چۆنە؟، چونکە تۆ هەر چۆن بیر لە خودا بکەیتەوە، دڵنیابە خودا زۆر لەم بیرکردنەوەی تۆ دوورە، ئێمەی موسڵمان بەعەقڵ و ویژدانەوە دەڵێین:

خودای مەزن نەشێوەی هەیە، نە لە هیچ شتێك دەچێت، ئاگاداری هەموو شتێکە، هەموو شتێك دەبینێت، هەموو شتێك دەبیسێت، تەنانەت ئەو نهێنیانەی ناو دڵ و دەروونیش دەزانێت و لێیان ئاگادارە، زانست و زانیاری و ئاگاداربوونی هێندە زۆرو فراوانە سەرجەم ئەو بوونەوەرانەی لە ئێمەوە دیارن و ئەوانەی لەئێمەش دیارنین دەرگرێتە خۆی، هیچ شتێك بۆی نیە تەنانەت بۆماوەی یەك چرکە یان یەك چاوتروکان لە دەسەڵات و دیدو زانست و ئاگاداری ئەو بزرو شارلوە بێت، کاتێ ویستی لەسەر هاتنەکایەو داهێنانی شتێك بێت هەر لەگەڵ ویستەکەی شتەکە هاتۆتەدی، هەروەکو فەرموویەتی:

[1] لێرە مەبەستمان زانیاری و زانستی ئایینزا نیە، گومانمان لەوە نیە کە هەر کەسێك زانست و زانیاری دەربارەی ئایین و خواپەرستی هەبێت، ئەوا باوەڕێکی تۆکمەو بەهێزو نەگۆڕی لە دڵ و دەروونیدا چەسپاوەو بەتەواوی پەروەردگاری ناسیوە، تەنانەت ئەگەر بێتو ئەو کەسە نەخوێندەواریش بێت گرنگ ئەوەیە زانیاری هەیە سەبارەت بە ناسینی خودای مەزن.

﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ﴾

واتە:فەرمانی ئێمە بۆ هەموو شتێك تەنیا یەکێکە وەك چاوتروکانێکە.

پێش ئێستا ئاماژەمان بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی فیزیای گەردوون کرد سەبارەت بە هێنانەدی گەردوون، ئەم ئایەتە پیرۆزەی ڕابردوو ڕاستی و دروستی ئەم توێژینەوەیە دەسەلمێنێت، لەبەر ئەوەی زانایانی فیزیك دەڵێن:

چاوتروکانێك لە ڕووی کاتەوە دەکاتە= ١چرکە÷$١٠^{٣٢}$ یەك چرکە دابەش دە توان سی و دوو.

ئیتر داواکارم لە یەزدانی پاك و بەخشندە، ئەم زانست و زانیاریانەی ڕابردوو بکاتە پەیژەیەك بۆ پێشڤەچوونی تاکی موسڵمان و بەهێزکردنی بیرو باوەڕو ئایینزای سەبارەت بە پەروەردگاری مەزن و کاربەجێ...

# بەشی دووەم

## چ پێویستە دەربارەی پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) بزانین

لە بەشی ڕابردوودا زانیمان باوەڕهێنان بەخودای گەورەو بەتوانا هەمیشە پەیوەستە بەئاستی زانست و زانیاری خودی مرۆڤەوە، بەڵام لەم بەشەدا سەبارەت بەپێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت)دەدوێین، تا بزانین چی پێویستە لەسەر تاکی موسڵمان سەبارەت بەم کەڵە پیاوە بەرزو پیرۆزانە بیزانێت، چونکە بێگومان ئێمەی ئادەمیزاد لەڕێگای ئەوانەوە(سڵاوی خودایان لێبێت) باوەڕمان بە پەروەردگاری مەزن هێناوە، کەواتە باوەڕهێنان بەپەروەردگار پەیوەستە بەباوەڕهێنان بەڕاستی ودروستی پەیامە پیرۆزەکەیان، باوەڕیش هەروەکو لە ڕابردوو ئاماژەمان بۆی کردوە، هەمیشە لەناو دڵ و دەروونیدا سرەوتو دەبێت و ئۆقرە دەگرێت، هەروەها ئەم باوەڕە پەیوەستە بە ئاستی زانیاری و زانستی خودی مرۆڤەکە خۆی.

کەواتە لەسەر ئێمەی موسڵمان پێویستە گەشە بە زانست و زانیاریمان بدەین و هەوڵ بدەین زیاتر ئاشنا بین بەژیاننامەی پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت)، چونکە بێگومان هەرچەند پتر زانیاری دەربارەی ئەم کەڵە پیاوانە بەدەست بێنین و زیاتر شارەزایان بین، ئەوا بیرو باوەڕمان تۆکمەترو بەهێزتر دەبێت.

بەڵام هەندێ زانیاری زۆر وردو پێویست هەیە دەربارەی پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) پێویستە لێرە بەکورتی ئاماژەیان بۆ بکەین، بەڵکو ببێتە هۆکارێك بۆ گەشەکردن و پەرەپێدانی زانست و زانیاریمان و پتەوکردن و بەهێزکردنی بیرو باوەڕو ئایینزامان بەم پیاوە شکۆدارو پیرۆزو بەرزو بەڕێزانە.

## پێغەمبەران(سلاوی خودایان لێبێت) بۆچی نێردراوون:

ماددەپەرستان لەڕێگای فەلسەفەوە بەدرێژایی مێژوو هەمیشە هەوڵیانداوە گومان بخەنە نێو دڵی خەڵکەوە سەبارەت بە پێغەمبەران و پەیامە پیرۆزەکانیان، نکۆڵیان لەڕاستی ودروستی پەیامەکانیان کردوە، هەروەك چۆن نکۆڵی لە جیهانی گیانەکان دەکەن و پێیانوایە جگە لەم جیهانە ماددیەی بەچاو دەبینرێت هیچ جیهانێکی تر لە ئارادا نیە، بەهەمان شێوە نکۆڵی لە پەیامی پیرۆزی ئەوانیش دەکەن.

تەنانەت زانای ئەڵمانی(دکتۆر مسمەر) ساڵی(١٧٧٠)ی زایینی توانی نواندنی یان خەوتنی موگناتیسی بدۆزێتەوە، ئیتر لەڕێگای ئەم دۆزینەوەیەدا سەلماندرا کەوا جەستەی ئادەمیزاد تەنیا لە ماددە پێکنەهاتوە، بەڵکو گیانیشی گرتۆتەخۆی کە پێچەوانەی ماددەیە لە هەموو ڕووێکەوە،هەروەها(دکتۆر مسمەر) بەمەش نەوەستا بەڵکو ئاماژەی بۆ ئەوەکرد، چۆن لە خودی مرۆڤدا هەستێك وهۆشێکی دیکە هەیە، زۆر لەم هەستەو لەو هۆشەی ئاسایی خۆی بەرزترو هوشیارترە، ئیدی ئەم هۆش و هەستە شاراوەیەی ناو ناخ وخودی مرۆڤ هەمیشە پەیوەستە بەجیهانی سرەوتووی گیانەکانەوە واتە(عالەمی ئەڕواح)، ئەم بۆچوونەی زانای ئەڵمانی (دکتۆر مسمەر)، زانایانی ماددەپەرستی هێنایە هەژان، بۆیە بەدرێژایی سەدەیەك دژایەتی ئەم بۆچوونەیان دەکرد، بەڵام لەئاکامدا بۆچوونەکەی ئەم زانایە سەرکەوت، چونکە توانی بە بەڵگە ڕاستیەکان بسەلمێنێت و دانپێنانی زانستی بەدەست بێنێت، ئەنجامی بۆچوونی ئەم زانایە بریتیبوو لە:

(مرۆڤ تەنیا ئەوە نیە وەك دەیبینین لە ناو ئەم جەستە ئاژەڵی ئاسایە ئابلوقە دراوە،بەڵکو لە ناخەوە پەیوەستە بە هێزێکی نادیاری شاراوەی بەرز، ئەم هێزەش پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەجیهانی سرەوتووی گیانەکانەوە هەیە، ئەم پەیوەندیەش پلەو پایەی جیا جیای هەیە).

ئیتر ئەم بۆچوونەی دکتۆر مسەمەر تۆزێك لەوە نزیکمان دەکاتەوەو تیشك دەخاتە سەر ئەوە تا بڵێین:

لەم پەیوەندیەی نێوان گیانی مرۆڤەکان و جیهانی ئەودیو سروشت، گیانی هەندێ کەس پەیوەندیان زۆر بەهێزبووە، لەپلەو پایەی یەکجار بەرزدابوونە، خودای مەزن و بەرزو زانا هەندێ گیانی لەم گیانە خاوەن پەیوەندیە بەهێزانەوە هەڵبژاردوەو پاڵاوتوە، تا پەیامێکی بەرزو پیرۆزیان پێ بسپێرێت و پەیامەکە بیگەیەنن بە نەتەوەی خۆیان بەتایبەتی، وێرای سەرجەم بوونەوەرانیش بە گشتی.

بێگومان باوەڕهێنان بە هەموو پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) یەکێکە لە ستوندەکانی باوەڕهێنان بەئایینزاو ئایینی پیرۆزی ئیسلام، چۆن پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾

واتە: موسڵمانان بە گاورەکان بڵێن، ئێمە باوەڕمان بەخودا هێناوە هەروەها بەم قورئانەی بۆمان دابەزیوە، وە بەم کتێبانەی بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و یەعقوب و دوازدە کوڕەکانی یەعقوب دابەزیوون،وە بەم کتێبانەی بۆ موسا وعیسا دابەزیوون، وە باوەڕمان بە هەموو ئەو(موعجیزانە) هێناوە کەخودا پشتیوانی پێغەمبەرانی پێ کردوە، جیاوازی ناکەین لە نێوان پێغەمبەرەکاندا باوەڕمان بە هەموویان هەیە، ئێمە مل کەچین و خۆمان داوەتە دەست بۆ خودای مەزن لەژێر فەرمانەکانی ئەو ڕەفتار دەکەین.

کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمانان باوەڕیان بە سەرجەم پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) هەبێت، ئەوەی باوەڕی تەنیا بە یەك پێغەمبەر نەبێت لە

پێغەمبەرانی پەروەدگاری مەزن، ئەوا دیارە ئەو کەسە باوەڕی تەواو نیە، بەڵکو موسڵمان نیە چۆن پەروەردگاری مەزن و کاریەجێ فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٍ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقًّاۚ ﴾

واتە: بەڕاستی ئەوانەی باوەڕ بەخوداو پێغەمبەرانی ناهێنن وە دەیانەوێت جیاوازی بکەن و بخەنە نێوان باوەڕهێنان بە خوداو پێغەمبەرەکانی خوداو دەڵێن باوەڕ بە هەندێ پێغەمبەر دەهێنین بەڵام بە ئەوانەی تریان ناهێنین وەکو (جولەکەکان باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی عیساو موحەممەد نەهێنا، هەروەها نەسرانیەکان باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد(سڵاو و دروودی خودا لە خۆی و هەموو پێغەمبەران بێت) نەهێنا چۆن ویستیان ڕێگایەکی مامناوەندی هەڵبژێرن لە نێوان گومڕایی و باوەڕدا، ئەوانە گاوری ڕاستەقینەن).

چونکە هیچ ڕێگایەکی دیکە لەنێوان ڕێگای باوەڕهێنان و ڕێگای گومڕاییدا لە ئارادا نیە،کەواتە ئەوەی باوەڕی بە ڕاستی ودروستی پێغەمبەرایەتی تەنیا یەك پێغەمبەر نەبێت لەو پێغەمبەرانەی ناویان لە قورئان و کتێبە ئایینیەکاندا هاتوە، ئەوا مرۆڤێکی گومڕایەو موسڵمان نیە. هەروەها پێویستە هەموویان (سڵاوی خودایان لێبێت) بەڕێزو پڕ لە شکۆوە سەیربکرێن و ناویان بهێنرێت.

پێویستە ئێمەی موسڵمان باوەڕێکی ڕاستەقینەو بێگومانمان هەبێت و بزانین سەرجەم پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) ئادەمیزادن، پیاون واتە (ڕەگەزیان نێرە)،مرۆڤی ئازادن هەرگیز بەکۆیلایەتی وبەندایەتی نەژیاون،هیچ کەموکوڕیەکیان لە لاشەو جەستەدا نەبووە، خاوەن بەرزترین و چاکترین خو و ڕەوشتن، زادەی چاکترین و شکۆدارترین ڕەچەڵەکن، هەمیشە ڕاستگۆبوونە.

**پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) دوو جۆرن:**

**یەکەم: ئەو پێغەمبەرانەی پەروەردگاری مەزن ئەرکی گەیاندنی پەیامێکی پێ سپاردوون تابەخەڵك ڕایبگەیەنن، پەیامەکان بریتین لەکۆمەڵێك فەرمان و بەرنامەو ڕێنمایی، پەیامەکان چەندین مەرج و هۆکارو قەدەغە کردن و نکۆڵی لێکردن و بەڵگەو ڕاستکردنەوەو گەفکردن و موژدەو شتی دیکەیان گرتۆتەخۆیان، سەبارەت بەجێبەجێ کردنی پەیامەکان چەندین بەڵێن و پەیمانی پاداشت و سزادانیان لەلایەن پەروەردگارەوە پێیە، واتە نێردراون بۆ نەتەوەیەك یان کۆمەڵە خەڵکێك، ئەوانەی خاوەن پەیامن لە قورئانی پیرۆزو لە زمانی عەرەبیدا بە (ڕەسول) واتە نێردراو ناویان هاتوە.**

**دووەم: ئەو پێغەمبەرانەی خاوەن پەیام نەبوون، بەڵکو لەناو نەتەوەکەی خۆیاندا یان کۆمەڵگاکەی خۆیاندا بەپێی پەیامی پێغەمبەرە خاوەن پەیامەکەی سەردەمی خۆیان خوا پەرستیان کردوەو ڕێنمایی خەڵکیان کردوە هانیان دەدان بۆ پەیڕەو کردنی پەیامەکەو ئایینەکە، یان لەسەر ئایین و پەیامی پێغەمبەری پێشووی خۆی خوا پەرستی و ڕێنمایی خەڵکی دەکرد، لە قورئانی پیرۆزو لە زمانی عەرەبیدا ئەم پیاوە ڕێزدارانە بە(نەبی) ناویان هاتوە،﴿نەبی لەزمانی عەرەبیدا لە ـ نبأ ـ هاتوە، (نبيء) واتە ئەگەر وشەکە چوکلەی یان(ء) هەمزەی لە کۆتاییدا هاتبوو، بەمانای (لەخوداوە هەواڵی پێدەگات و پێی فەرمووە، ئەو واتە خودا تاك وتەنیایەو ئەمیش (نەبیە) واتە پێغەمبەرە، بەڵام ئەگەر بە (النبوة) واتە بێ (ء) چوکڵە ماناکەی شی بکەینەوە، بەمانای بەرزو پایەداری دێت، واتە بۆیە پێی گوتراوە (نەبی) چۆن پایەدارو بەرزە لەنێو خەڵکدا﴾.**

**پێغەمبەرایەتی هەرگیز بەخۆماندوکردن وبیرکردنەوەو هەوڵ و تێکۆشان نەبوە، بەڵکو پەروەردگاری مەزن بەپێی زانستی لەبن نەهاتووی خۆی هەندێ پیاوی هەڵبژاردوە تا ئەم چاکەیەو بەخششەیان لەگەڵدا بکات، چونکە پەیامەکان سۆزو**

بەزەیی و بەخششی پەروەردگارن بۆ سەرجەم بوونەوەران، بۆیە پەروەردگاری کاربەجێ هەرخۆی دەزانێت چۆن ئەم پیاوە ڕێزدارانەی پالاوتوەو هەڵبژاردوە، هەروەها بێگومان زانیویەتی شایان بە هەلگرتنی ئەو پەیامانەن و لەئاست جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە پیرۆزەن بۆیە لەناو سەرجەم خەڵکدا ئەم ڕێزدارانەی بە پەسند زانیوەو ئەم ئەرکە قورسەی پێسپاردوون.

**گرنگترین ئەرکی پێغەمبەران(سلاوی خودایان لێبێت):**

ئەرکی سەرەکی پێغەمبەران(سلاوی خودایان لێبێت) بریتیە لە:

١ـ بانگەواز کردن بۆ باوەڕهێنان بە خودایێکی تاك و تەنیا.

٢ـ باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی و سزا.

٣ـ گەیاندن و ڕوون کردنەوەی پەیامی خودا.

**١ـ بانگەواز کردن بۆ باوەڕهێنان بە خودایێکی تاك و تەنیا:**

باوەڕهێنان بە خودا ئاکارێك وخەسلەتێکی ڕەمەکی وخۆڕسکە لەناو دڵ و دەروونی ئادەمیزادا،هەموو مرۆڤێك هەست دەکات هێزێکی بالادەست ومەزن هەیە پەلکێشی دەکات بۆلای خۆی، بەلام ئەم هێزە بالا دەستە هەر یەکێك بە جۆرێك پێناسەی دەکات، هەندێ بە هێزی سروشتی و هەندێکی دیکە بە ماددە، بگرە هەندێکی تر بەم ناو و ناتۆرانەش نەوەستان بەڵکو بەردو دارو شتی تریان کردە (بت)و پێیان وابوو ئەمە ئەو هێزەیە کە گیانی مرۆڤ هەمیشە پێیەوە بەندەو ئارەزووی دەکات.

پێغەمبەران(سلاوی خودایان لێبێت) هەوڵیاندا ئەم بیرو بۆچوونە چەوت و هەڵەیە لە مێشکی خەڵکدا ڕاست بکەنەوە، چۆن ڕێنماییان کردن و بۆیان ڕوون کردنەوە کە پەروەردگارێکی تاك و تەنیا هەیە، پێویستە باوەڕی پێ بهێنین.

پێغەمبەران(سلاوی خودایان لێبێت)، هەمیشە لەهەموو کات و شوێنێکدا تاکە مەبەست و گەورەترین ئامانجیان ڕاستکردنەوەی بیرو بۆچوون و ئایینزای خەڵك بووە سەبارەت بەخودای تاك و تەنیا، هەروەها مەبەستیان توندو تۆڵ کردنی

پەیوەندی نێوان خوداو بەندەکانی بووە، خەڵکیان فێرکردوە کە ئایینپەروەری و خوا پەرستی پێویستە تەنیا بۆ خودای تاك و تەنیا بێت، نابێ لە خودای تاك و تەنیاو مەزن وبالآدەست بەملاوە هیچ شتێکی دیکە بپەرستڕێت، چۆن تەنیا پەروەردگاری مەزن و بالآو داناو زاناو توانا شایان بەپەرستنە، پێویستە لەهەموو کات و ساتێکدا تکاو نزاو پاڕانەوەو هانا تەنیا بۆ ئەو ببردرێت ، هەمیشە مرۆڤ تەنیا چاوی لە بەخشش و چاکەی ئەوبێت، داوایان لە نەتەوەو هۆزەکانیان دەکرد واز لە بت پەرستن، یان مرۆڤ پەرستن و....هتد بێنن، بێگومان ئەگەر بهاتبایە لەڕێگای پێغەمبەران(سلآوی خودایان لێبێت)ئەم کارو ڕێنماییانە ئەنجام نەدرابوایە ئەوا هۆش وبیری مرۆڤ هەرچەند پێشەکەوتو و ڕۆشن بوایە هەرگیز بەم دەرەنجامە نەدەگەیشت، بەڵکو لە پێدەشتی عەقڵ و زانست و زانیاریەکانی خۆیدا هەریەکێك لە کۆتاییدا لە ڕێگایەکی تاریك و کوێردا سەرگەردان وێڵ و داماو و دەستەو ئەژنۆ دەمایەوە، بەتایبەتی دەربارەی ئەو شتانەی نادیارو بزرو شاراوەن واتە(غەیب)ن، چونکە شتە شاراوەو بزرەکان(خودا،بەهەشت،دۆزەخ،دوارۆژ،فریشتە،پەری، گیان ...هتد) بە سروش لە ڕێگای پێغەمبەران ( سلآوی خودایان لێبێت ) بە خەڵك ڕاگەیاندراوە، ئەگەر ئەوان نەبونایە بێگومان ناوی هیچیان نەدەزانرا.

ڕاستە بە بەردەوامی هەوڵدراوە ولێکۆڵینەوە کراوە، بۆپێناسە کردن و ئاشنابوون بەو هێزەی پێش ئێستا ئاماژەمان بۆی کرد، چەندین زانای بەناو بانگ لە بوارو ئاستی جیاجیای زانیستیدا هەوڵەکانیان خستەگەڕ،تا زانست و زانیاریێك دەربارەی ئەودیو سروشت بەدەست بێنن، بەلآم سەرجەم هەوڵەکان ئاکامەکانیان ئەرستۆ ئاسا، نەیانتوانی سەبارەت بەم هێزەی ئەودیو سروشتەوە ئەنجامێکی ڕاست و دروست و کۆتایی بەدەست بێنن، کەچی ئەم زانیاریە بە پێزەو بێ گومانەی پێغەمبەران (سلآوی خودایان لێبێت) سەبارەت بەم هێزە بەخەڵکیان ڕاگەیاندوەو ڕوونیان کردۆتەوە، کە ئەم هێزە هێزێکی هەمیشەییەو بێ سەرەتاو بێ کۆتاییە،

داهێنەری سەرجەم گەردوون و بوونەوەرانە، ئیتر ئەم زانیاریە پیرۆزو گرنگ و مەزنە بوەتە مایەی ئۆقرەگرتن و سرەوتنی عەقڵ و ویژدان و دڵ و دەروونی گشت مرۆڤێکی موسڵمان.

**٢ـ باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی و سزا:**

بێگومان دواڕۆژ، یان ڕۆژی دوایی ئەمەش یەکێکە لە شتە شاراوەکان و نادیارەکان، بۆیە ئەگەر هەر یەکێك ئەسپی خۆی لەم بوارەدا تاوبدات، ئەوا هەرگیز بە ئاکامێك و دەرەنجامێکی پوخت و لەبار ناگات، بۆیە ئەمەش یەکێکە لە ئەرکەکانی سەرشانی پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت)، کەڕێنمایی خەڵك بکەن بۆ گەیشتن بە ڕێگای ڕاست و دروست سەبارەت بە زیندوبوونەوەو لێپرسینەوە، چونکە زۆربەی خەڵك هەست دەکەن و پێیانوایە هەرگیز ئەم ژیانە بە کۆتایی هاتنی تەمەن کۆتایی نایەت، بەڵکو دەبێ شێوە ژیانێکی دیکە لەدوای مردندا هەبێت، کەواتە ناکرێ ئەم هەستەی زۆربەی خەڵك فەرامۆش بکرێت و بە بۆچوونێکی چەوت و گومڕا دابنرێت هەروەکو ماددە پەرستان پێیانوایە ئەم بووچوونە و هەستکردنە ڕێگاییێکی ئەفسانەو گومڕاییە.

وێڕای ئەمە نەبوونی ئەم هەستە لەدڵ و دەروون و مێشکی خەڵکدا، یان نەمانی ئەم هەستەو لەناوبردنی، واتە ئەگەر خەڵك باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نەمێنێت، بێگومان دەبێتە مایەی مەینەت و نانەوەی کارەسات لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە، چونکە هەر یەکێك لەئێمە کاتێ لە ژیاندا تووشی کارەسات و نەخۆشی و نەهامەتی و ستەم و دەردەسەری و دابڕان دەبێت، ئیتر چاوی هیواو ئومێدی دەبڕێتە دواڕۆژو جیهان و ژیانی دوای مردن، تا لەوێ پاداشتی ئارام گرتن و خۆڕاگری لە ئاست کارەساتەکان وەربگرێتەوە.

سەرەڕای ئەمەش هەست کردن و باوەڕبوون بەژیانی دواڕۆژو زیندوبوونەوە، دەبێتە هۆی هاتنەکایەی ویژدانێکی کاراو زیندوو لە خودی مرۆڤدا، ئیتر هەست

بەلێپرسینەوە دەکات، لە ئاکامدا دوور دەکەوێتەوە لە کارو ڕەفتاری نابەجێ و ناڕەوا، بەڵکو هەمیشە کاری پەسندو چاك ئەنجام دەدات، بێگومان ئەگەر پێغەمبەران نەبوونایە(سڵاوی خودایان لێبێت)ئەوا هەرگیز ئەم هەستەو ئەم باوەڕە لە مێشکی مرۆڤدا گەڵاڵە نەدەبوو، چونکە مێشکی مرۆڤ ئەو کاتە بەپێی ئەندێشەو بیرو بۆچوونی خۆی ڕەنگە جۆرێك لەپاداشت و سزای بۆ چاکەو خراپەکاری دادەنا.

## ٣ـ گەیاندن و ڕوونکردنەوەی پەیامی خودا:

ئەرکێکی دیکە لە ئەرکەکانی پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت)، گەیاندنی ئەو پەیامەبووە کەبووەتە مایەی بەختەوەری خەڵك لە هەردوو جیهاندا، واتە مایەی بەختەوەری ئەم جیهانە کاتیەی ئێستاو جیهانی هەمیشەیی دواڕۆژە، هەروەها ڕێنماییی خەڵکیان کردووەو پەیامەکانیان بۆ ڕوون کردوونەتەوە، تا کاری چاك و پەسند ئەنجام بدەن و بتوانن ڕەزامەندی خوداو کۆمەڵگاکەیان بەدەست بێنن، چونکە بەم جیاوازیە زۆرەی لە نێوان بەرژەوەندی و ئاوات وحەزو ئارەزووی جۆراو جۆری خەڵکدا هەیە، بێگومان سەرجەم خەڵك هەرگیز ناتوانن بەردەوام کاری چاکە و ڕەواو پەسند ئەنجام بدات، بۆیە دەتوانین بڵێین ڕەنگە هەندێ کارو کردەوەی نارێك و نابەجێ و قێزەوون،بەدیدو بۆچوونی هەندێ کەس کاری ڕەواو پەسندبێت، لەبەر ئەوەی ڕەنگە بۆ ئەم سوودبەخشەو بەرژەوەندی خۆی لەم کارە نارێکەدا بەدی بکات، ئیتر ئەمجۆرە کەسە ڕەنگە حەز بەکاری چاکە نەکات، چۆن لەگەڵ بەرژەوەندی وحەزو ئارەزووەکانی ئەو یەك ناگرێتەوە، بۆیە هەرچەندە ئەمڕۆ جیهان لەوپەڕی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژیادایە کەچی دەبینین ستەم و چەوسانەوەو پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە هەموو شوێنێك و کونجێکی گۆی زەویدا لە ئارادایە، ئیتر بۆیە پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) ڕێگای چاکەو خراپەیان

بۆ خەڵك ڕوون کردۆتەوە تا کۆمەڵگاکان بە ئاسوودەیی بژین و مرۆڤ بتوانێت ڕەزامەندی پەروەردگار و خەڵك بەدەست بێنێت.

**گرنگترین ئاکاری پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت):**

بێگومان ئێمەی موسڵمان باوەڕمان بە پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) هێناوەو دەزانین پەیامە پیرۆزەکانیان ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیە، چونکە باوەڕهێنان بە پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) پەیوەستە بەچەند خاڵێکی گرنگ لە ڕەفتارو کردەوەی ژیانی ڕۆژانەی ئەم پیاوە بەڕێزانە.

گرنگترین خاڵە سەرەکیەکانی ڕەفتارو کردەوەو ئاکارەکانیان بریتین لەمانەی خوارەوە:

یەکەم: ئەو ڕەفتارانەی هەمیشە بە پێناسەی پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) ناسراون:

١- ڕاستگۆیی.

٢- ئەمینی.

٣- ڕاگەیاندنی پەیام.

٤- ئاگادارو هوشیاری.

دووەم: ئەو ڕەفتارانەی پێویستە نکۆڵیان لێ بکەین هەرگیز پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) نەیانکردەوەو لێی دووربوون:

١- درۆکردن.

٢- خیانەتکردن.

٣- شاردنەوەی پەیام.

٤- بێ ئاگایی.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵانەی سەرەوە بەگشتی دەڵێین: پێویستە سەرجەم موسڵمانان باوەڕیان بەڕاستگۆیی پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) هەبێت کە

ڕاستە ئەم پەیامەیان لەلایەن پەروەردگاری بەرزو باڵاوە بۆ هاتوەتە خوارەوەو بە ڕاستی بەخەڵکیان گەیاندوە، کەواتە پێویستە لە هەمان کاتدا نکۆڵی لەوەبکەین کە هەرگیز درۆیان نەکردوە لەو پەیامەدا.

ڕاستگۆیی لەگەیاندنی پەیام واتە ئەو دەق و ناوەرۆکەی ئەوان(سڵاوی خودایان لێبێت) گوتوویانە لەگەڵ واقیعدا بگونجێت و دژایەتی یەکتری نەکەن بۆنموونە: گوتوویانە(تەنیا یەك تاکە خودا هەیە، جگە لەم خودایە هیچ خودایێکی دیکە نیە)، ئەمە دیارە ڕاستیان فەرمووە، چونکە ئەم گوتنە لەگەڵ واقیعدا دەگونجێت.

هەروەها ئەگەر درۆییێك لەوان ڕوویدابوایە مانای وایە لە پەیامەکەی پەروەردگار ڕوویداوە( خودای بەخشندەو میهرەبان بمانبوورە تۆو پێغەمبەرانت هەمیشە پاك و بێگەردن)، چونکە ئەوان (سڵاوی خودایان لێبێت) فەرموودەو پەیامی خودای مەزن بە خەڵك ڕادەگەیەنن، بۆ سەلماندنی ڕاستگۆییان دەبینین خودای باڵاو مەزن بە کارو ڕووداوی لە ڕادەبەدەر واتە(موعجیزە) پشتیوانی پێغەمبەرانی دەکات، پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت)کارێکی وایان ئەنجام دەدا ئەم کارە لە تواناو بیرو بۆچون و کردەوەکانی مرۆڤ بەدوور بوو، هەرگیز کەس بۆی نەبوو لاسایی ئەوان بکاتەوەو کاری لەمجۆرە ئەنجام بدات، وەك:(هەڵقوڵانی ئاو لە پەنجەکان، زندوو کردنەوەی مردوو، نەسووتان بەئاگر.....هتد)، بە موعجیزەکان خودای باڵادەست بەخەڵك ڕادەگەیەنێت کە ئەم پەیامەی پێغەمبەرەکەی من تەواوە، ئەگەر باوەڕیش ناکەن سەیرکەن ئەوە موعجیزەی ڕاستگۆیی ئەوە لە گوتەکان و پەیامەکەیدا.

سەرەڕای ئەوەش ئەگەر پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) ڕاستگۆنەبن، کەواتە سەرجەم پەیامەکان و ئایینەکانیش ڕاستنین، بەڵام خودای مەزن فەرموویەتی:

﴿وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾

واتە:وە پێغەمبەران ڕاستیان گوتووە.

﴿ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ ﴾

واتە: خودا گوتنی پێغەمبەرەکەی پشتڕاست کرد.

هەروەها لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمان پێویستە باوەڕی بە(ئەمینی) پێغەمبەران (درودی خودایان لێبێت) هەبێت، لەهەمان کاتدا هەرگیز(خیانەتیان) نەخاتە پاڵ و هەمیشە نکوڵی لێبکات.

(ئەمینی) واتە سەرجەم ئەندامانی جەستەیان ئەوەی دیارەو ئەوەی شاراوەو نادیارە، پارێزراو بووە لە هەموو جۆرە کارو ڕەفتارێکی نابەجێ و قێزەوون و (حەرام)، جا ئەم کارو ڕەفتارە گەورەبێت یان بچووک بێت.

بەڵام (خیانەت) پێچەوانەی (ئەمینیە) واتە ئەنجامدانی کارو ڕەفتاری نابەجێ و قێزەوون و حەرام.

کاتێ لێکۆڵینەوە لەسەر ژیان و ڕەوشتی پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) دەکەین دەبینین هەموویان خاوەن کەسایەتیێکی یەکجار بە شەرم و بە ئابڕوون، هەمیشە لە گشت قۆناغەکانی تەمەنیاندا خۆیان لە تاوان و خراپەکاری پاراستوە، پاشان لە هەموو کەس زیاتر خوایان ناسیوە، خودای مەزن بە زانست و زانیاری فراوان و لەبن نەهاتووی خۆی، ئەوانی لەناو سەرجەم بوونەوەراندا هەڵبژاردوەو پالاوتوە، کاری باڵوێزی و نێردراوی پێسپاردوون تا پەیامی پیرۆزی خودا بە خەڵك ڕابگەیەنن، ئەوانیشی بە ڕاستگۆ ناساندوە، کەواتە بێگومان دەبێ پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لێبێت) پێشەواو پێشەنگی نەتەوەکانیان بن، بۆیە خودای مەزن فەرمانمان پێدەکات هەمیشە لە کردەوەو ڕەفتارو گوفتارماندا دەبێ شوێن کەوتووی ئەوان بین، گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان بین و لە ژیانی ڕۆژانەماندا لاسایی ڕەفتارو کردەوەی ئەوان بکەینەوە، کەواتە ئەگەر بهاتایە ئەوان خیانەتیان بکردایە لە ناوەڕۆك و لە گەیاندنی پەیامەکەدا، ئەوا بێگومان خودای مەزن هەرگیز فەرمانی

پێنەدەکردین شوێنکەوتوویان بین، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبوو، هەروەکو خودای مەزن فەرموویەتی:

﴿ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُوا۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُوا۟ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

واتە:ئەی هۆزەکەی من شوێنکەوتووی پێغەمبەران بن، شوێنکەوتووی ئەوانەبن کە هیچ پاداشتیان لێتان ناوێت و ئەوان ڕێگای ڕاستیان گرتۆتەبەر.

هەروەها فەرموویەتی:

﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ ﴾

واتە: من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە.

هەروەها فەرموویەتی:

(إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ)

واتە: بەڕاستی خودا مرۆڤی خاینی خۆشناوێت.

هەروەها پێویستە باوەڕمان بەپێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) هەبێت کە پەیامەکانیان بێ کەموکوڕی بە خەڵك ڕاگەیاندوە، هیچیان بیر نەچۆتەوەو لە خەڵك نەیانشاردۆتەوە، چونکە ئەگەر هێندەی تۆزقاڵێك پەیامەکانیان شاردبێتەوەو بە خەڵکیان ڕانەگەیاندبێت دیارە خیانەتیان کردوە، بەڵام بێگومان ئەوان هەرگیز خیانەتیان نەکردوە، بەڵکو هەموو شتێکی گەورەو بچووك، زۆرو کەم، گرنگ و ئاساییان بەخەڵك ڕاگەیاندوە، لە قورئانی پیرۆزدا چەندین ئایەتی پیرۆز سەبارەت بە گەیاندنی پەیامی خودای مەزن هاتووە، بۆ نموونە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾

واتە: ئەی پێغەمبەر ئەوەی بۆت دابەزیوەتە خوارەوە لە پەروەردگارت بەخەڵکی ڕابگەیەنە ئەگەر وانەکەیت کەواتە پەیامەکەت ڕانەگەیاندوە.

هەروەها پێویستە بزانین پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت)هوشیارو ئاگاداربوون مرۆڤی بێ ئاگاو سادەو ساویلکە نەبوون، کەسایەتییێکی بەهێزیان هەبوو، هەمیشە لەگەڵ خەڵك وتووێژیان کردوەو بەڵگەی بەهێزیان هێناوەتەوە بۆ بێ باوەڕان تا باوەڕ بە پایەکەیان و بە ئایینەکەیان بێنن، لەکاتی وتووێژو قسەکردندا زۆر هێمن و لەسەرخۆو نەرمونیان بوونە، هەمیشە هەڵچوون و تورەبوونیان نەبووە، تەنانەت هەندێ جار دوای ئازارو ئەشکەنجەیەکی یەکجار زۆر لە خودا دەپاڕانەوەو دەیانگوت خودایە میللەتی ئێمە نەزانن داوات لێدەکەین بیانهێنە سەر ڕێگای ڕاست.

بەڵام دروستە بڵێین ئەوانیش(سڵاوی خودایان لێبێت) تووشی نەخۆشی و برسیەتی و هەژاری هاتوون، ئەوانیش خواردن و خواردنەوەو نووستنیان هەبووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دووربوون تەنانەت لە بچووکترین ڕەفتاری کەم و پڕوپووچ بۆ نموونە: وەك شت خواردن بە ئاشکرا لەسەر ڕێگاو لەناو بازاڕدا لەبەر چاوی خەڵك، هەرچەندە ئەم کارە بەدیدو بۆچوونی ئێمە بچووکترین کاری کەمە، وێڕای ئەوەش ئەوان هەرگیز نەیانکردوە، جەستەو لاشەیان لە هەموو ڕوویێکەوە بێ کەموکوڕی بووە، پەروەردگاری مەزن توانای دیتن و بیستنی فریشتەی پێ بەخشیبوون، تەنانەت دەنگی مێروولەیان دەبیست، کەواتە ئاستی بیستن وبینینیان زۆر بەهێزتر بووە لە مرۆڤی ئاسایی، ئەوەش بێگومان بەهرەیەك وبەخششێکی خودابووە پێیان بەخشراوە، نەوە لەدوای نەوە هەمیشە لە باپیران و باوك و دایکی داوێنپاك هاتوونەتەکایەوە، واتە زادەو پاشکەوتەی ڕەچەڵەکی خاوێن و پاکن.

جگە لەمەی ڕابردوو ئەگەر بهاتایە ئەو مرۆڤە ڕەوشت بەرزو بەڕێزانە پەیامبەری خودا نەبوونایە، بۆچی خۆیان دەخستە ناو گێژەلوکی دەریای ڕق و قینی میللەتەکەی خۆیان بگرە تێکڕای خەڵك؟، بۆچی خۆیان تووشی ئازارو ئەشکەنجەو نەهامەتی و گیروگرفت و دەربەدەری دەکرد؟، کام پێغەمبەر (سڵاوی خودایان

لێبێت) لەشارو وڵات و زێدی باوك و باپیرانی دەرنەكراوەو دەربەدەرو ئاوارەنەبووە بە نامۆیی ژیانی نەبردۆتەسەر، ئەگەر مەبەستیان خۆشگوزەرانی و ماڵ و سامان بوایە، ئەوا سەركردەی هۆزەكان و پادشاكان و گەورە پیاوانی میللەتەكانیان گەنجینەو سامانێكی یەكجار زۆریان بۆ دابین دەكردن، بەڵام كەچی دەبینین بەپێچەوانەوە ئەوان سەرجەم خەڵكیان ئاگادارو هوشیار كردۆتەوە كە ماڵ و سامان و منداڵ و خاوخێزان، ئەمانە گشتیان بۆ ڕازاندنەوەی ژیانی ئەم جیهانە كۆتایی هاتوەیە، تاوەكو هەرگیز پێیان لەخشتەنەچین، ئاگادارین لە پێناویاندا پەروەردگار لەخۆمان نەڕەنجێنێن و خۆمان تووشی تاوان و خراپەكاری نەكەین.

پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) فەرمانی خودای مەزنیان بەلاوە لە هەموو ئەشكەنجەو ئازارێكی ژیان گەورەترو پیرۆزتربوو، بۆیە هەمیشە بێباكبوون لە دژایەتی كردن و بەرهەڵستكردن، تەنیا ترسی خودایان لەدڵ و دەروونداهەبوو، وێرای ئەمەش خودی خۆیان و خاوخێزان و ماڵ و سامانیان بەختكردوە لەپێناو بڵاوكردنەوەو گەیاندنی ئایین و پەیامی خودای مەزن.

ئەوەی ماوە سەبارەت بەم مرۆڤە ڕێزدارو شكۆدارانە بیدركێنین:

بیست وپێنجیان ناویان لە قورئاندا هاتووە، لەوانە پێنجیان خاوەن وورەی بەرزن (نوح - ئیبراهیم - موسا - عیسا - موحەممەد - سڵاو و دروودی خودایان لێبێت).

هەروەها یاوەری ڕێزدار (ئەبوزەڕی غەفاری - خودالێیڕازیبێت) دەڵێ:

لە پێغەمبەرم(درودی خودای لەسەربێت) پرسیاركرد ژمارەی پێغەمبەران چەندە ؟، فەرمووی: سەدوبیست و چوار هەزارە، گوتم: چەندیان خاوەن پەیامن، فەرمووی: سێ سەدو سێزدە.

# بەشی سێیەم

## چ دەزانین دەربارەی فریشتەو پەری

مرۆڤ زانیاری و زانستی دەربارەی ئەو شتانەی نادیارو بزرن، بەچاو نابینرێن واتە (غەیب)ن، تەنیا لەڕێگای بیستنەوە پێیدەگات، باوەڕکردن بەهەبوونی شتە نادیارو غەیبیەکان دەوەستێتە سەر ڕادەی متمانەکردن وباوەڕبوون بەچاوگ و سەرچاوەی زانست و زانیاریەکە، واتە تا چ ڕادەیەك باوەڕمان بەڕاستگۆیی ئەو کەسە هەبێت کە سەرچاوەی زانیاریەکەیە، ئا ئەوەندەش باوەڕمان بە هەبوونی شتەکە لادروست دەبێت و گەلاڵە دەبێت.

بێگومان فریشتەو پەری(مەلائیکە و جن) دوو بوونەوەری نادیارو بزرن(غەیبن)، کەواتە ئەو زانیاری وزانستانەی دەربارەیان هەیە تەنیا لە ڕێگای بیستنەوە هاتۆتە کایەوە، زانیاریەکانیش تەنیا لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە(سڵاوی خودایان لێبێت) ڕاگەیاندراون و لەوانەوە بیستراوە، بۆیە ئەو کەسەی باوەڕی بەڕاستی و دروستی پەیامەکان هەبێت ئەوا باوەڕی بە بوونی ئەم دوو بوونەوەرە هەیە، چونکە تەنیا لەم بەڕێزانە ناوی فریشتەو پەری بیستراوە. واتە ئەگەر ئایینە ئاسمانیەکان نەبوونایە، ئەوا کەس زانیاری دەربارەی فریشتەو پەری نەدەبوو بگرە تەنانەت ناویان نەدەبیسترا.

ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر ئەگەر چاوێك بە ناوەرۆکی سەرجەم ئایینە ئاسمانیەکاندا بخشێنین، دەبینین زۆربەی سەرچاوەی ئەو زانست و زانیاریانەی زانراوون و بیستراوون سەبارەت بەم دوو بوونەوەرە لە قورئانەوە هەڵقوڵاوون، چونکە قورئان لە سەرجەم کتێبەکانی دیکە پتر باسی فریشتەو پەری تێدا هاتووە، بۆیە لێرە دەتوانین بڵێین کەسێك کە باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد(درودی خودای

لەسەربێت) هەبێت، بێگومان دەبێ باوەڕی بەو زانیاریانە هەبێت کە سەبارەت بە فریشتەو پەری لە قورئاندا هاتووە. سەرەڕای ئەوەش ئەگەر ئێمە زانیاریمان دەربارەی شتێك نەبوو، هەرگیز نابێ وا هەست بکەین کە ئەم شتە لە ئارادا نیە، چۆن لەبەر ئەوەی ئێمە زانیاریمان دەربارەی نیە.

ئەوانەی باوەڕیان بەقورئان وپێغەمبەرایەتی موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) نیە، پێیانوایە هەموو ئەو شتە نادیار و (غەیبانەی) لە قورئاندا ناویان هاتووەو باسکراون، هیچ بنەمایێکی زانستی دروستیان نیە، بە بیانوی ئەوەی زانستی هاوچەرخی ئەمڕۆ نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە بوونیان بسەلمێنێت.

ئەم بیانوە لە ڕووی زانستیەوە زۆر هەڵەیە، چونکە چەندین دیاردەی سەیرو نامۆ لە گەردوون و لەم سروشتەدا هەیە تا ئێستا زانایان زانیاری تەواویان دەربارەی ئەم دیاردانە بەدەست نەهێناوە، جا چجای جیهانێکی دیکەی نادیارو شاراوەو یەکجار نامۆ، سەرەڕای ئەوەش کەسێك هەڵگری مەشخەڵی زانست بێت و مێشکی بە زانست زاخاو کرابێت هەرگیز نکۆڵی لە شتێك ناکات تا ئەنجامێکی زانستی تەواوی لەبەر دەستدا نەبێت سەبارەت بەشتەکە،چونکە زانایان دەزانن لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە دەبێ بە ئاکامی ڕاست و دروست بگەن، وێڕای ئەوەش زۆر جار زانایان لەچەندین بواری جیاجیادا پێیانوابوە گەیشتوونەتە کۆتایی و ئاکامی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکەیان کەچی لەپڕ کۆمەڵێك شتی نادیارو شاراوە و پرسیار دەربارەی بابەتەکە سەر هەڵدەدات، ئیتر ئەو کاتە زانایان خۆیان لەبەردەم ناشارەزایێکی لەبن نەهاتوودا دەبیننەوە. هەروەکو پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی :

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾

واتە: تیرو توانج لە شتێك مەگرە کە زانستت دەربارەی نەبێت. یان شوێنکەوتوی شتێك مەبە کە زانستت دەربارەی نەبێت.

کەواتە با بەرەو ئەم جیهانە شاراوە بچین و چەند زانیارییێك بخەینە ڕوو:

## یەکەم: فریشتە. ملائیکە. (الملائکە):

پەروەردگاری پڕتواناو مەزن فریشتەی لە ڕووناکی(نور) دروستکردوە، فریشتەکان ڕەگەزی نێرو مێیان نیە، بەڵکو هەموویان یەك جۆرە ڕەگەزن، بۆیە زاوزێ ناکەن، هەروەها خواردن و خواردنەوەیان نیە، خەوتن و بۆرژانیان نیە، لەو ساتەی هاتوونەتەدی تا ڕۆژی دوایی واتە تا کۆتایی هاتنی ئەم جیهانە دەمێنن، واتە مردنیان تا ئەو کاتە بۆ نیە، وەکو ئێمەی ئادەمیزاد و پەری ڕێچکەو ئایین و پێغەمبەریان نیە، هەر فریشتەیەك یان چەند فریشتەیەك بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانێك تەرخانکراون ئیتر لە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە بەملاوە هیچ کارێکی دیکە ئەنجام نادەن.

هەروەها فریشتەکان هەرگیز بۆیان نیە خۆیان بگۆڕن بۆشێوەی یەکتری واتە بۆ شێوەی فریشتەیەکی تر، بەڵام بۆیان هەیە بگۆڕدرێن بۆ شێوەی ئادەمیزاد.

**گۆڕینی شێوەی فریشتە بۆ شێوەی ئادەمیزاد:**

جگە لە پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت)ئێمەی ئادەمیزاد توانای بینین و بیستنی فریشتەمان نیە، تەنیا ئەگەر فریشتەکان خۆیان بگۆڕن بۆ شێوەی ئادەمیزاد ئەو کاتە دیدی ئێمە توانای بینینی فریشتەی هەیە، بۆ نموونە:

﴿ وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا سَلَامًا ۖ قَالَ سَلَامٌ ۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَأَىٰ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۚ قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِن وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾

واتە: کاتێ نێردراوانمان (ئەو فریشتانەی ناردرابوون بۆ لەناوبردنی میللەتی لوط) موژدەیان هێنا بۆ ئیبراهیم، گوتیان سڵاو گوتی سڵاو، ئەوەندەی نەخایاند گۆشتی

برژاوی گوێرەکەی بۆ هێنان، بەڵام بینی دەستیان بۆ خواردنەکە درێژ نەکرد نەیدەناسین و لێیان ترسا، گوتیان مەترسە ئێمە بۆ لەناوبردنی میللەتی لوط نێردراوین، خێزانەکەی ئیبراهیم خزمەتی میوانەکانی دەکرد کاتێ ئەمەی بیست پێکەنی موژدەمان پێیدا کە ئیسحاقی دەبێت و دوای ئەویش یەعقوب دەبێت.

ئەمەو دەیان ئایەتی پیرۆزی تر بەڵگەی ئەم ڕاستیەن و دەیسەلمێنن کە فریشتە بە فەرمانی خودای مەزن شێوەکەی دەگۆڕێت بۆ شێوەی ئادەمیزاد، تەنانەت بەجۆرێك ئیبراهیم پێغەمبەر(سڵاوی خودای لێبێت)هەستی نەکردو نەیزانی ئەمانە فریشتەن و ئادەمیزادنین، وێڕای ئەمەش دیارە سارای خێزانی ئیبراهیم لەم شێوەیەدا توانای بینینی فریشتەی هەبوو تەنانەت توانای ئاخاوتن و بیستنیشی هەبوو.

**فریشتە بۆ مەبەستی تایبەت دروستکراون:**

پەروەردگاری زاناو پڕتوانا ئێمەی ئادەمیزادی بۆ مەبەستێکی تایبەت هێناوەتەدی و دروستکردوە، هەروەکو پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾

واتە:پەری و ئادەمیزادم بۆهیچ دروست نەکردوە تەنیا بۆ خودا پەرستی نەبێت.

بەڵام فریشتەکان بۆ ئەنجامدانی جۆرە کارێك دروستکراون هەرگیز جێبەجێ کردنی ئەم کارانە لەئاست توانای ئادەمیزادا نیە، بۆیە جیاوازییێکی بێ ئەندازەی یەکجار زۆر لە نێوان هێزو توانای فریشتەو هێزو توانای ئێمەی ئادەمیزادا هەیە، هێزی ئێمە هەرگیز بەراوورد ناکرێت لەگەڵ هێزی ئەوان، چونکە زۆر کەمترە لە هێزی فریشتە، وەکو ئاماژەمان بۆ کرد بۆیان هەیەو دەتوانن خۆیان بگۆڕن بۆ شێوەی ئادەمیزاد، بۆ سەلماندنی هێزو توانای فریشتەو گۆڕینی شێوەیان بۆ شێوەی ئادەمیزاد، سەیرکە چۆن پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ﴿٨١﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾ ﴾

واته:فریشتەکان بە لوطیان گوت هەراسان مەبە ئێمە نێردراوی پەروەردگاری تۆین، ئەوانە ناتوانن بە خراپە نزیك بکەونەوە لێت، فەرمانیان پێیکرد لەکۆتایی شەودا کەسوکاری خۆی لە ئاوەدانیەکە بباتەدەر و هیچ یەکێکیان ئاوڕ بۆ دواوە نەداتەوە تەنیا هاوسەرەکەی نەبێت ئەویش تووشی هەمان کارەساتی میللەتەکەی دەبێت، بەیانی کاتی دیارکراوی لەناوبردنیانە، دیارە (لوط) ئەوەندە لە ڕەفتاری قێزەونی میللەتەکەی بێزارو بێ ئومێد بووە بۆیە حەزی کردوە سزاکەیان هەر ئەوکاتەو دەمودەست بێت و دوا نەخرێت، بۆیە فریشتەکان گوتیان ئایا بەیانی کاتێکی نزیك نیە؟. لەگەڵ گزنگی خۆردا فریشتەی ڕێزدار(جبرائیل) ئەو شارەی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان لەوێوە سەرەو ژێری کردو بۆ زەوی فڕێدایە خوارەوە و بەرد باران کران بە بەردێکی قوڕینی کاریگەری ئامادە کراو بۆ ئەم مەبەستەو بەدوای یەکتریدا هاتوو واتە بەردەکان بەلێزمە بەسەریاندا دەباری، ناوی تاوانبارەکە لەسەر بەردەکە نووسراوبوو واتە بەردەکان دیاریکراوبوون، ئەم جۆرە سزایە لە ستەمکاران بەدوور نیە.

سەرنجبدە چۆن کاتێ فریشتەکان هاتوونەتە سەر شێوەی ئادەمیزاد پێغەمبەری خودا لوط (سلاوی خودای لێبێت) نازانێت ئەوانە فریشتەن تا فریشتەکان خۆیان پێیان گوت ئێمە فریشتەین نێردراوی پەروەردگارین، هەروەها بزانە فریشتە چ هێزێکی سەیری پێدراوە چۆن توانای بەرز کردنەوەی ئەم شارەی هەبوو بە خاك و

خۆڵەوە بە سەرجەم دانیشتوان و خانوبەرەو.....هتد، هەمووی بەرز کردۆتەوە بۆ بەرزایی ئاسمان ئینجا لەوێوە سەرەنگوونی کردوە.

**بەربەست و پەردەو دیوار ڕێگری فریشتە نیە:**

هیچ بەربەستێك و پەردەیەك کار لە بینین و بیستن و تێپەڕبوونی فریشتەکان ناکات، هەروەکو پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾

واتە: بڵێ گیانتان فریشتەی مەرگ(مردن) دەریدەکات کە ئەو کارەی ئێوەی پێ سپێردراوە، پاشان بۆلای پەروەردگارتان دەگەڕێنەوە واتە لە ڕۆژی دوایی.

وەك دیارەو ئاشکرایە فریشتەی مەرگ (عزرائیل) هیچ بەربەستێك و پەردەیەك و شورەیەك بەربەست نیە لەبەر دەمیدا و لەهیچ شوێنێك ناسلەمێتەوەو ناگەڕێتەوە.

**سەرجەم فەرمانەکانی خودا جێبەجێ دەکەن:**

هەروەها فریشتەکان هەرگیز بۆیان نیە فەرمانی خودای بەرزو مەزن جێبەجێ نەکەن و سەرپێچی بکەن، هەروەکو پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾

واتە: لەسەر دۆزەخدا فریشتەی دڕواری ڕەق ئەستورو توندو تیژ وەستاون یاخی نابن لەو فەرمانانەی خودای مەزن پێیان دەکات و هەر فەرمانێکیان پێبکات جێبەجێی دەکەن.

**فریشتە باڵی هەیە:**

شێوەی جەستەیان وەك لەم ئایەتە پیرۆزەی داهاتوودا هاتووە دیارە باڵیان هەیە:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾

واتە:سوپاس بۆ ئەم خودایەی داهێنەرو دروستکاری ئاسمانەکان و زەویە(کە بێ وێنەن)، فریشتەی کردوەتە نێردراو(لەنێوان خۆی و پێغەمبەرانی)، خاوەنی باڵن دوو سێ و چوار باڵیان هەیە، بیەوێت زیاتریش دەکات (باڵی زیاتر، بوونەوەری زیاتر، دەنگی خۆشتر)، بەڕاستی خودا تواناو دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا(درودی خودای لێبێت) هاتووە، فەرموویەتی کاتێ لە شەوی (میعراجدا) چووەتە ئاسمانەکان فریشتەی سروش واتە جیبرائیلی لەسەر شێوەی ڕاستەقینەو سروشتی خۆی بینیوە شەشسەد باڵی هەبووە، نێوان هەر باڵێك هێندەی نێوانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوابووە.

## ژمارەی فریشتەو یاوەریوونیان:

ژمارەی فریشتەکان نەزانراوەو دیارنیە چەندە، بەلام بێگومان ژمارەیان یەکجار زۆرە، چونکە هەر بوونەوەرێك لەم گەردوونەدا چەندین فریشتە سەرپەرشتی دەکەن و کارەکانیان بەڕێوەدەبەن و یاوەریانن، بەلام لەبەرئەوەی ئاستی زانستی ئێمەی ئادەمیزاد لەم بوارەدا نزمەو شارەزاییمان نیە، بۆیە نازانین شێوەی بەڕێوەبردنەکە یان یاوەریەکەیان چۆنەو بەچ شێوەیەکە، چونکە جیهانی فریشتە هەروەکو لە دێرەکانی ڕابردوودا ئاماژەمان بۆی کرد، جیهانێکی شاراوەو نادیارە، بەلام خودای مەزن و کاربەجێ لە قورئانی پیرۆزدا سەبارەت بە یاوەربوونیان فەرموویەتی:

﴿ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴾

واتە:هەموو کەسێك فریشتەمان بەسەریدا داناوە چاودێریان دەکات کارو کردەوەو قسەکانیان دەپارێزن و تۆمار دەکەن.

کەواتە ڕەفتاری چاك و خراپی بەندەکان دەپارێزن تا ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە.

هەروەها پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ۝١٠ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ۝١١ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ۝١٢ ﴾

واتە: وە بەڕاستی ئێوە چاودێرتان بەسەرەوەیە لە فریشتە بەڕێزە تۆمارکارەکان، ئاگاداری ڕفتارو کردەوەکانتانن دەزانن چی دەکەن.

سەرەڕای ئەمە ئەو کارو ڕەفتارانەی ڕۆژانە، بەدرێژایی تەمەنمان ئەنجامی دەدەین ئەم فریشتە یاوەرانەمان کۆپی دەکەن، هەروەکو پەروەردگاری زاناو بالآدەست فەرموویەتی:

﴿ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾

واتە:ئەوە نوسراوو بەڵگەی ئێمەیە بەڕاست و ڕەوایی قسەتان لەسەردەکات ئێمە کردەوەکانی ئێوەمان کۆپی دەکرد.

بێگومان ئەم کۆپی کردنەش لە ڕێگای فریشتەکانەوە جێبەجێ دەکرێت.

ئەمەو چەندین ئایەتی دیکە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون ئاماژە بە تۆمارکردنی ئاخاوتن و ڕەفتارەکانی ئێمە دەکەن، دەیسەلمێنن کە فریشتە یاوەری ئێمەو سەرجەم بوونەوەرانی دیکەن.

**یاوەربوونی فریشتە یەکێکە لە هۆکارەکانی دیارنەبوونی:**

یەکێك لە هۆکارەکانی شاراوەیی و دیارنەبوونی فریشتە، بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە تا ئێمە هەست بەجوولەو بزووتنەوەو بوونی ئەم یاوەریەتیەیان نەکەین، چونکە ئەگەر بهاتایە فریشتە بەچاو ببینرایە و هەستمان بە بوونیان بکردبوایە ئەو کاتە بێگومان ژیانمان لاتاڵ دەبوو، هەرگیز نەماندەتوانی هیچ کردەوەیەك ئەنجامبدەین و ژیانمان تێکدەچوو.

هەروەها پەروەردگاری کاربەجێ ئێمەی ئادەمیزادی بۆ خواپەرستی و ئەنجامدانی کاری چاکە دروستکردوە، وێڕای ئەمەش حەزو ئارەزو و هیواو خۆشەویستی ژیانی ئەم جیهانەی خستۆتە ناو دڵ ودەروونمانەوە، لەسەر زاری پێغەمبەرانیش (سلآوی

خودایان لێبێت) چۆنیەتی ڕێگای خوداپەرستی و چاکەکردن و ڕێگای گومڕایی و خراپەکاری دیارکردوە، فریشتەکانیشی کردۆتە چاودێر بەسەرمانەوە، کەواتە ئەگەر بهاتایە ئەو چاودێرانە بەچاو ببینرابان ئەو کاتە لەترسانا کەس کاری خراپەی ئەنجامنەدەدا، یان دەبوایە هەموو سات و کاتێك شەڕو ئاژاوەو بگرەو بەردە لە نێوان چاودێران و خراپەکاران لە ئارادابوایە، ئیتر ژیان هیچ تاموچێژێکی نەدەما، سەیرکەن پێغەمبەران(سلاوی خودایان لێبێت) تەنیابانگەوازی خەڵکیان بۆ پەرستنی یەك تاکە خودا دەکرد، لە ئاکامدا تووشی چ ناسۆری و نەهامەتی و ئەشکەنجە بوونەوە، چۆن دەریەدەرو ئاوارەبوون، کەواتە ئەگەر تاوانباران بەچاو فریشتەکانیان بدیبایە کاتێ تاوان و کارە نابەجێکانیان دەنووسی، ئیتر ژیانیان لا تاڵ دەبوو جارێکی تر یان تاوانیان ئەنجام نەدەدایەوە، یان گرژی و ئاڵۆزی دەکەوتە نێوان تاوانباران و فریشتەکان، ئاخۆ لە ئاکامدا چ کارەساتێك ڕوویدەدا.

ئەمە لەلایەك لە لایەکی دیکە ئەگەر بهاتایە فریشتەکان دیارو ئاشکرابوونایە واتە بەچاو ببینرابان، ئەوا ئەو کاتە خەو و خواردن و هەڵسوکەوتی ژیانی ڕۆژانەمان هەمووی تێکدەچوو، بەڵام وەك دیارە پەروەردگاری کاربەجێ سەرجەم دروستکراو و بوونەوەرانی زۆر بەپوختەیی و بەڕێکی و بێ هیچ کەموکورییێك داهێناوەو دروستکردوە.

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾

واتە:ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەو بە پێی پێویست داهێناوەو دروستکردوە.

سەبارەت بەناوی فریشتەکان ئەوەی زانراوە تەنیا چەند فریشتەیەك ناوی ئاشکراو دیارە، ئەوانیش ژمارەیان لەپەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکات، وەك:

جبرائیل: بە(ڕوح) ناوی لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە، ڕازگری گواستنەوەو گەیاندنی سروشی خودا بووە بۆ پێغەمبەران(سلاوی خودایان لێبێت).

عزرائیل: بە(ملك الموت ـ فریشتەی مردن) ناوی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

میکائیل:

ئیسرافیل:

هەڵگرانی عەرش(حملە العرش).

دەرگەوانانی بەهەشت.

دەرگەوانانی دۆزەخ.

نەکیرو مونکەر: تایبەتن بە پرسیارکردنی ناو گۆڕ لە ئادەمیزاد.

## دووەم: پەری(جنۆکە ـ جن):

### پەری لەئاگر دروستکراوە:

پەروەردگاری داناو یەکجار زاناو پڕتوانا پەری لەئاگر دروستکردوەو هێناوەتەدی هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ ﴾

واتە: وە پەری لە بلێسەی بێگەردی ئاگر داهێناوەو دروستکردوە.

بێگومان تواناى خودا لەبن نەهاتوە هەرچی بیەوێت دروستی دەکات، پەریش وەك فریشتە ئاسا لە ئاستی بیستن و بینین و هەستی ئێمەی ئادەمیزادا نیە، کەواتە لە جیهانێکی شاراوەو نادیاردا دەژین واتە(غەیب)، پەری ئێمەی ئادەمیزاد دەبینێت، بەڵام وەکو ئێمە ئەوانیش فریشتە نابینن، کەواتە فریشتە خۆی و پەری و ئادەمیزاد دەبینێت، بەڵام پەری خۆی و ئادەمیزاد دەبینێت، ئێمەی ئادەمیزاد تەنیا خۆمان دەبینین.

### پەری ڕەگەزی نێرو مێی هەیە:

پەری وەکو ئێمەی ئادەمیزاد هۆش و بیرو ویست و حەزو ئارەزوویان پێدراوە، هەروەها ئەرکی بەجێهێنانی کاری ئایینیان پێسپێردراوە، هەردوو ڕەگەزی نێرو مێیان هەیە واتە جووتبوون و بەهاوسەربوونیان هەیە،بۆیە نەوەو بێچوو دەنێنەوە،

بەلام ئاخۆ لەڕووی فەسلەجەو فسیۆلۆجیەوە چۆنە؟ دەلێین تەنیا خودای مەزن و زاناو داناو توانا دەزانێت بە چ شێوەیەك و بەچ ڕێگایەکە.
بەلام چۆن دەزانین دوو ڕەگەزن واتە نێرو مێن بۆ ئەم وەلامە پەنا دەبەینە بەر قورئانی پیرۆز دەبینین فەرموویەتی:
﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ۝٦ ﴾
واتە: هەندێ لە پیاوانی ئادەمیزاد داوای یارمەتی و بەهاناهاتنیان لە پیاوانی پەری (جنۆکە)دەکرد بۆیە ئەوان بەسەریاندا زالتربوون و چەوسانەوەیان زیاتربوو .
(لەسەردەمی نەزانین و بتپەرستیدا، واتە پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام عەرەبەکان دابونەریتیان وابوو، لەو شوێنەی تێیدا دەژیان بەدەنگێکی بەرز دەیانگوت ئەی پیاوی پەری، سەرپەرشتیاری ئەم ناوچەیە، ئێمە خۆمان خستە پەنای تۆوە بمانپارێزەو ئازارمان مەدە).
لێرە مەبەستمان هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە نیە، بەلکو بە پێویستی دەزانم هەلوێستەیەك لەسەر ووشەی پیاوانی پەری(برجال من الجن)بکەین،چونکە پێموایە ئامازەکردن بۆ(پیاوانی پەری) بەلگەیە کەوا پەریش ڕەگەزی نێرو مێیان هەیە، ئەگەر ئەم دوو ڕەگەزەیان نەبوایە ئەوا ووشەی پەری واتە(جن) بەتەنیا مانای تەواوی خۆی دەبەخشی بۆ بەهاناهاتنەکە،هەروەها هیچ گومان لەوەدا نیە ووشەی پیاو ئەو مانایە دەگەیەنێت کە بەرامبەر بەوە ژنیش هەیە، شتێکی بەلگە نەویستە ئەگەر بێتو نێرو مێ لە هەر بوونەوەرێکدا هەبێت ئەو کاتە دەبێ زاوزێش هەبێت، ئینجا مەرج نیە ئەم زاووزێکردنە لەڕووی فەسلەجەو فسیۆلۆجیەوە کتومت بەهەمان شێوەی ئادەمیزاد بێت چونکە ڕەنگە جیابێت.
هەروەها پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:
﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ۝٥٦ ﴾

واتە: پێخەف و نوینەکانی بەهەشت کچی تێدایە ئەم کچانە چاو بۆ کەس هەڵنابڕن و چاویان ناگێڕن، پێش بەهەشتیەکان نەئادەمیزاد و نەپەری نزیکیان نەکەوتوون.

ئەمە بەڵگەیەکی تری ئاشکراو ڕوونە کە پەری جووتبوون و بە هاوسەریوونیان هەیە، بۆیە ناویان لەگەڵ ناوی ئادەمیزادا هاتووە، چونکە سەرنجبدە ئەگەر لە ئایەتەکە تەنیا ناوی ئادەمیزاد بهاتبوایە ماناو مەبەستەکەی خۆی دەپێکا، کە بریتیە لە پاکی و بێگەردی کچەکانی بەهەشت، بەڵام دیارە پەری هەمان کاری جووتبوونی ئادەمیزاد ئەنجام دەدەن بۆیە ناویان هاتووە.

**پەری پێش ئادەمیزاد هاتۆتەدی و دروستکراوە، ژمارەیان زیاترە:**

**پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:**

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾

واتە: وە ئادەمیزادمان لە قوڕێکی وشکی ڕەشهەڵگەڕاو دروستکردوە، قوڕەکە دەنگی زرنگانەوەی دەهات، وە پەریمان دروستکردوە پێشتر، واتە پێش ئادەمیزاد، لە ئاگرێکی زۆر بەتین.

ژمارەی پەری لەژمارەی ئادەمیزاد زۆر زیاترە، چونکە ئەوان پێش ئادەمیزاد هاتوونەتەکایەوەو هەمیشە لە زاووزێ کردن بەردەوامبوونە، کەواتە دەبێ ژمارەیان زیاتربێت، سەرەڕای ئەمەش لەگەڵ هەر مرۆڤێك یان مەردمێك دوو پەری هاوجووتن کەواتە دەبێ ژمارەیان زۆر زیاتربێت لە ئادەمیزاد.

**هێزو توانایان لە ئادەمیزاد زۆر زیاترە:**

هێزو توانای پەری جیاوازە لە هێزو توانای ئادەمیزاد، پەری زۆر بەهێزترە لە ئادەمیزاد، بەڵگەی ئەم بەهێزیەیان بەسەرهاتەکەی سولەیمان پێغەمبەرە(سڵاوی خودای لێبێت) کاتێ ویستی کۆشکی خاتو(بەلقیس)ی پادشای یەمەن بێنێتە لای

خۆی پێش ئەوەی خاتوو(بەلقیس) بگاتەلای ئەو، یەکێك لە پەریەکان گوتی من کۆشکەکەت بۆ دێنم...ئیتر(تەواوی ئەم بەسەرهاتە دەتوانی لە سوڕەتی ئەلنەمل بخوێنیتەوە)، دوایی یەکێك لە پەریەکان کە زانابوو لە میانەی چاوترووکانێکدا کۆشکەکەی گواستەوەلای سولەیمان پێغەمبەر(سڵاوی خودای لێبێت)، بەڵام سەبارەت بە گواستەوەکە ئەمە دەقی ئایەتە پەیوەستەکانی ئەم بابەتەیە:

﴿ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ مِّنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾

واتە:یەکێك لە پەریە چالاك و کاراکان گوتی من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی لەم شوێنەی خۆت هەستیت و بڕۆیت، (بەیانیان دەهات بۆ حوکمڕانی تا نیوەڕۆ لەم شوێنە دادەنیشت)، وەمن هێزم پێیدادەشکێت و ئەمینم لە پاراستنی ئەو زێڕو سامان و کەلوپەلە بەهاداروو بە نرخانەی لە کۆشەکەدا هەیە، بەڵام سولەیمان پێغەمبەر(سڵاوی خودای لێبێت) ویستی زووترو خێراتر کۆشکەکەی بۆ بێت، بۆیە یەکێکی دیکە کە خاوەنی زانستی ناوەمەزن و پیرۆزەکانی خودای مەزن بوو گوتی سەیری شوێنێك بکە پێش ئەوەی چاوت بۆ لای ئێرە بگەڕێتەوە من کۆشکەکەت بۆ دێنم،(سولەیمان لەو کاتە سەری بەرز کردەوە سەیری ئاسمانی کرد کاتێ سەری نزم کردەوە بۆ زەوی بینی کۆشکەکە لای ئەو دانراوە).

**لە گۆی زەویدا پەری بەریەستی بۆ نیە:**

پەری دەتوانن لەسەرتاسەری زەویدا بێن وبچن، هەروەها تواناییان هەیە لەگەڵ ئێمەی ئادەمیزادا لەسەر زەوی دابنیشن و بژین، هەروەکو لە ئایەتە پیرۆزەکەی ڕابردوودا ئەمەمان بۆ ڕوون کراوەتەوە، چۆن لەگەڵ سولەیمان پێغەمبەر(سڵاوی خودای لێبێت) دانیشتوونەو فەرمانەکانیان جێبەجێ کردوە. تەنانەت دەتوانن سەرکەون بۆ ئاسمان، بەڵام سەرکەوتنیان بۆ بەرزایی ئاسمان سنووردارە، ناتوانن

لەم سنوورەی بۆیان دانراوە زیاتر سەریکەون و تێپەڕن، هەروەکو لەدەقی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا بەدەردەکەوێت چۆن پەروەردگاری کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ ﴾

واتە: ئێمە ویستمان بچین بۆ ئاسمان بەڵام بینیمان پڕبوە لە پاسەوانی زۆر بەهێزو بەردی گڕدار، وە ئێمە پێشان لە ئاسمانەکان شوێنی دانیشتنمان هەبوو بۆ گوێگرتن وبیستن کەچی ئێستا ئەوەی گوێ رابگرێت و ببیستێ ئەوا بەردێکی گڕداری بەردەکەوێت.

**پەری لە ئێمەو فریشتە دەکات:**

پەری وێڕای بیستنی دەنگی ئێمە،دیارە توانای تێگەیشتنی قسەو گوفتاری ئێمەی هەیە، هەروەکو خودای باڵادەست فەرموویەتی:

﴿ قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾ ﴾

واتە: موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بڵێ خودا بەسروش پێیگوتم هەندێك پەری هاتوونەلام کاتێ قورئانیان بیستوە زۆر بەلایانەوە سەیریووە ماناکەیان زۆر بەلاوە ڕێکوپێك و جوانبووەو چۆن داوای خودا پەرستی تەنیا بۆ یەك تاکە خودا دەکات باوەڕیان بە قورئان هێنا کە لە خوداوە هاتوە بۆیە پەریەکان موسلمان بوون گوتیان ئێمە باوەڕمان هێناو ئیتر کەس ناکەین بەهاوبەش بۆ پەروەردگارمان.

هەروەها پەری لەقسەو ئاخاوتنی فریشتەکان دەگەن بۆیە خودای بەرزو باڵادەست فەرموویەتی:

﴿ لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ ﴾

واتە: تا گوێ نەگرن بۆ فریشتەکان لە هەموو لایەکەوە بەردباران دەکرێن بە بەردی گڕدار تا دەربکرێن لەوێ.

ئەگەر لەقسەو ئاخاوتنی فریشتەکان نەگەن بۆچی گوێ دەگرن؟!.

یان بۆچی قەدەغە دەکرێن؟.

بەڵام وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە لەبەر ئەوەی بەردباران دەکرێن بە بەردی ئاگرینی گڕدار، بۆیە ناتوانن گوێ بگرن، وەئەگەر ووشەیەکیان بیست، ئەوا ناتوانن بیگەنن بۆ سەر زەوی، چونکە دەکەونە بەر تینی بەرد بارانەکە و دەسووتێن.

**پەری بۆ بەندایەتی و خوداپەرستی هاتۆتەدی:**

پەری وەکو ئێمەی ئادەمیزاد، پەروەردگاری بێباك لە هەموو بوونەوەرێك، بۆ بەندایەتی و خوداپەرستی دروستی کردوون و هێناویەتەدی، هەروەکو لە قورئاندا هاتووەو دەفەرمووێت:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾

واتە: پەری و ئادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردوە تەنیا بۆ خوداپەرستی نەبێت.

کەواتە لەم ڕووەوە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئێمەدا نیە، بۆیە ئەوانیش کەسانی چاك و کەسانی خراپیان لەناودا هەیە، ئایینپەروەرو تاوانباریان تێدا هەیە، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا پەروەردگاری سەرجەم بوونەوەران فەرموویەتی:

﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَٰٓئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ ﴾

واتە: پەری باسی خۆیان دەکەن کە ئێمەش پێش ئەوەی گوێمان لە قورئان بێت، هەندێکمان کەسانی چاکبووین و هەندێکمان وەك ئەوان نەبووین(واتە کەسانی چاك نەبووین)، هەندێکمان باوەڕمان نەبوو، ئێمە ڕێچکەو بۆچوونی جیاجیامان هەبوو، ئێمە باوەڕی ڕاستەقینەمان هەبوو کە ناتوانین لەژێر دەسەلاتی خوادا ڕابکەین، بۆ هەرشوێنێك بچین دەرچوونمان لە چنگی خوادا نیە، وە کاتێ گوێمان لە قورئان بوو بیستمان زانیمان ڕاستە باوەڕمان پێیهێنا، چونکە ئەوەی باوەڕی بە پەروەردگاری هەبێت بانەترسێت لەوە کە پاداشتی کەمدەبێتەوە خودا چاکەکانی کەم ناکاتەوەو ماندووێتی بە فیڕۆنادات و ستەمی لێناکات، جا ئێمە موسلمانمان هەیە و گاوریشمان تێدا هەیە کە باوەڕی بەخوداو پێغەمبەرو(درودی خودای لەسەربێت) قورئان نیە، ئەوانەی موسلمان بوونە و باوەڕیان هێناوە ئەوانە ڕێگای ڕاستیان گرتۆتەبەر، بەلام گاورەکان ئەوانە سووتەمەنی دۆزەخن.

کەواتە پەریش وەکو ئێمەی ئادەمیزاد کەسانی چاکەکارو خوداپەرست بەهەشتین، کەسانی تاوانبارو خودانەناسیش دەچنە دۆزەخ و سزادەدرێن، ڕەنگە هەندێ کەس بلێن:

**پەری خۆیان لە ئاگر دروستکراون، چۆن بە ئاگر سزا دەدرێن؟:**

لە وەلامدا دەلێین ئەوە بۆتواناى لەبن نەهاتووی پەروەردگار هەر هیچ نیە، چونکە هەرچی بیەوێت دەیکات، جا ئەوە گرنگ نیە ئاخۆ ئادەمیزاد بەم بیرو هۆشە تەسك و سنووردارەی لێی تێدەگات یان تێیناگات، چونکە ئەو کەسەی باوەڕی تەواو و نەگۆڕی بەتوانای لەبن نەهاتووی خودا هەبێت، هەرگیز مەرج دانانێت بۆ ئەم جۆرە کارانەو سەرجەم کارەکانی دیکەی خودا، مرۆڤی خاوەن باوەڕ هەرگیز نابێ باوەڕی بەم جۆرە کارو کردەوانە هەبێت کە تۆزێك یان تەواو شارەزایی لێی هەیە، بەلام نکۆڵی لەو جۆرە شتانە بکات کە ئەو شارەزایی لێی نیە، چونکە بێگومان عەقڵ و هۆش و بیری ئێمەی ئادەمیزاد سنووردارە، بۆمان نیەو لە تواناماندا نیە

هەموو شتێك شی بكەینەوە و بچینە چاووگ و بنەمای شتەكە، بەڵام نموونەیەكی بچووك و سادە دێنینەوە تا لەمیانەیەوە بتوانین چۆنیەتی سزا دانی پەری لە مێشكی سنووورداری خۆمان نزیك بكەینەوەو سوودی لێوەربگرین بۆ گەشەدانی تێگەیشتنمان و نزیك بوونەوەمان لە مەبەستەكە:

گریمان خودا بوونەوەرێك لە بەفر یان سەهۆڵ دروستبكات، چی تێدایە ئەگەر خودا ئەم بوونەوەرە بە ئاو ئازارو سزا بدات، كەچی هەمووومان دەزانین بەفر یان سەهۆڵ ئاوە بەڵام لەدۆخی ڕەقیدایە، ئەگەر لە ڕووی كیمیاییەوە سەیری بكەین دەبینین بەفرەكەو ئاوەكەو سەهۆڵەكە هەر یەكەیان لە دوو گەردیلەی هایدرۆجین و یەك گەردیلەی ئۆكسجین پێكهاتوە، بەڵام ڕەنگە كاتێ ئاوەكە بەسەر بوونەوەرە سەهۆڵەكە برژابوایەو بتوابوایەوە ئازارێكی زۆری بچەشتبوایە.

ئینجا با سەرجەم بوونەوەرەكانی تریش لە ڕووی ئازاردان وسزادانەوە بەم شێوەیە وەربگرین و بەمجۆرە سەیریان بكەین، ئەو كاتە دەبینین پەری كە خۆی لە ئاگر دروستكراوە سزادانیشی بەئاگر كارێكی نامۆ نیە، بەڵام چونكە پەری لە جیهانێكی دیكەی شاراوەو نادیاردایە، هەروەها وەكو لە ڕابردوو گوتمان سەرجەم ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە جیهانی شاراوەو نادیار بەندە بە باوەڕێكی تۆكمەو ڕاستەقینە بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) لە میانەی ئەویشەوە بە خودای بەرزو باڵادەست و پڕتواناو كاربەجێ.

**پەری هاودەم و هاوەڵی ئادەمیزادە:**

﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ ﴾

واتە: ئەو کەسەی لەئاست قورئان و یادکردنەوەی خودا کوێر بێت، ڕاستیەکان بەچاوی دڵ نەبینێت، دەیخەینە ژێر دەسەڵاتی پەرییك(شەیتانێك) ئیتر ئەو دەبێتە هاودەم و هاوەڵی، ئەو شەیتانانە ڕێگای ڕاستی و خواپەرستیان لێ گوم دەکەن، وا دەزانن لەسەر ڕێگای ڕاست و ڕەوان کەچی گومڕابوونە، تەنانەت کاتێ لەڕۆژی دواییدا زندووی دەکەینەوەو دێتەوە لای ئێمە،دەڵێ خۆزگە نێوانی من وتۆ هێندەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەیەکتر دوور بوایە چۆن تۆ خراپترین هاوەڵ و هامدەم بوویت.

بێگومان(شەیتان) لە ڕەگەزی پەریە، هەروەکو پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ﴾

واتە: سەرجەم فریشتەکان کڕنووشی ڕێزیان بۆ ئادەم جێبەجێ کرد،تەنیا(ئیبلیس) شەیتان نەبێت لە ڕەگەزی پەری بوو فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێ نەکرد.

ئەگەر بهاتایە ئیبلیس فریشتە بوایە، بێگومان نەیدەتوانی یاخی بێت و فەرمانەکە جێبەجێ نەکات، چونکە فریشتە هەرگیز توانای جێبەجێ نەکردنی فەرمانیان بۆ نیەو ئەم سەربەستیەیان پێنەدراوە وەکو پەری و ئادەمیزاد.

ئیتر بەهۆی نەبردنی کڕنووشی ڕێزلێنان بۆ ئادەمی باوکمان(سڵاوی خودای لێبێت) (ئیبلیس) کەوتە بەر نەفرەتی خودا، لەبەزەیی وسۆزو لێخۆشبوونی خودای مەزن دوورکەوتەوە، ئیدی لەم ڕۆژەوە تاڕۆژی دوایی خۆی و نەوەکانی هەمیشە خەریکی لە خشتەبردن و فریودانی نەوەکانی ئادەمن هەروەکو خودای مەزن فەرموویەتی:

﴿قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٢﴾﴾

واتە: ئیبلیس گوتی: پێمبڵێ چیەو کێیە ئەوەی لەمن ڕێزدارترت کردوە، (واتە فەرمانم پێدەکەیت تا کڕنووشی ڕێزی بۆ بەرم)،ئەگەر بێتو من دوابخەیت وبمهێڵیت

تا ڕۆژی زیندووبوونەوە، ئەوا نەوەکانی فرێودەدەم و لە خشتەیان دەبەم تەنیا کەمێکیان نەبێت.

# بەشی چوارەم

## چ دەزانین دەربارەی ئادەمیزاد

ئادەمیزاد یان(مرۆڤ ـ مەردم) بوونەوەرێکە پەروەردگاری مەزن ویستی وابوە زۆر لەدوای فریشتەو پەری دروستی کردوەو هێناویەتە ناو ئەم جیهانە، ئادەمیزاد لە ڕووناکی و لەبلێسەی ئاگر دروست نەکراوە،بەڵکو لەخۆڵ واتە لەخاك دروستکراوە، کەواتە ئەو ماددەیەی ئادەمیزادی لێ دروستکراوە لەگەڵ ماددەی فریشتەکان یان ماددەی پەری جیاوازە، بەڵام وێڕای ئەوەش پەری وەك ئادەمیزاد ئەرکی بەندایەتی و خوداپەرستی پێسپێردراوەو لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا هاوشانە.

ئادەمیزاد توانای بینین و بیستنی فریشتەو پەری نیە، بەڵام فریشتەو پەری ئادەمیزاد دەبینن و لە قسەو گفتوگۆکانیان دەگەن، هەروەکو لە بەشی ڕابردوو باسی ئەوەمان کرد.

**نهێنی ژیان:**

بێگومان لەویستی پەروەردگاری مەزندا بووە ئادەمیزاد دروست بکات و بێنێتەدی، بەڵام نهێنییێك هەیە لە هاتنەکایەی ئادەمیزادا، ئایا بۆچی پەروەردگاری مەزن لە سەرەتای داهێنان و دروستکردنی گەردوون، واتە لەسەرەتای دروستبونی شوێن و کات و ئاسمانەکان و زەوی و هەموو بوونەوەرەکان ئادەمیزادیشی دروست نەکردو لەگەڵ بوونەوەرەکانی دیکە نەیهێنایە ناو جیهانی ماددە؟.

ئەم نهێنیە تەنیا پەروەردگاری مەزن خۆی دەیزانێت و تەنیا لە زانستی لەبن نەهاتووی ئەودا ئەمە نهێنی نیە، چۆن پەروەدگار خۆی پلانی بۆ هەموو شتێك دارشتوە، بەپێی ویستی خۆی هەموو پێداویستیەکانی بێ هیچ کەموکورییێك بۆ

فەراهەم و ئامادە کردوە، پێویستی بەکەس نیەو لەهەموو بوونەوەرێك بێباکە، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾

واتە: ئەو خودایەی سەرجەم ئاسمانەکان و زەوی موڵکی ئەوە، وە کەسی نەکردوە بەکوڕی خۆی و کەس هاوبەشی نیە لەموڵك و لە دەسەڵاتدا، وەهەموو شتێکی بە ئەندازەو رێکوپێك (لەڕووی شێوەو قەبارەو تاموچێژو بۆن و ڕەنگ و هەمەجۆری و هتد) هێناوەتەدی و لەکاتی خۆیدا دروستیکردوە.

## زەوی چۆن لەبارپووە بۆ ژیان:

ئەگەر سەرنج بدەینە مێژووی هاتنەکایەی زەوی، دەبینین بەچەند قۆناغێك و دۆخێکدا تێپەڕیووە، تەنانەت لە ئاکامدا گەیشتۆتە قۆناغێکی لەبارو شیاو بۆ ژیانی ئادەمیزاد، لەسەرەتادا گۆی زەوی بە (٤) چوار کاتژمێر خولی سووڕانەوەی بە چواردەوری خۆیدا تەواو کردوە، واتە شەووڕۆژ بریتیبووە لەچوار کاتژمێر، دوایی بەرەبەرە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ خێراییەکەی هێور بۆتەوە تەنانەت گەیشتۆتە بیستوچوار کاتژمێر، سەرەڕای ئەوەش زەوی لەدەسپێکی جیابوونەوەی لە خۆرو خولانەوەیدا پێکهاتبوو لە تۆپەڵەیەکی ئاگرین، پاشان وورده وورده سارد بووەوە لە ئەنجامدا بوو بەتۆپەڵەیەکی بەرد، پەروەردگاری مەزن لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بۆ ئەم جیبابوونەوەیە دەکات و دەفەرمووێت:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴾

واتە: ئایا گاورو خودانەناسان نابینن و بۆیان ڕوون نەبۆتەوە چۆن ئاسمانەکان و زەوی یەکپارچەبوون دوایی لە یەکتریمان جیاکردنەوە.

لەبەشی یەکەمی ڕابردوو ئاماژەمان بۆ تەقینەوەی یەکجار مەزن کرد، ئیتر ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زانستی فیزیای گەردوون گەیشتۆتە ئاکامێکی ڕاست و دروستی ئەم جیابوونەوەیە، هەروەها سەلماندوویەتی لە ئاکامی تەقینەوەیەکی بە هێزو بێ وێنەدا ئەم گەردوونەو ئەم سروشتە هاتۆتە کایەوە.

دوای ئەوەی زەوی لە خولانەوەو خولگەی خۆیدا سرەوت و ئۆقرەی گرت ئاو هاتەدی، ئاوەکان یەکیان گرت دەریاکان هاتنە کایەوە، باران و باو هەواو گازەکان و تیشکی خۆرو بروسك و هەورە تریشقە هەموویان فاکتەری بەهێزو پڕ توانا بوون بۆ کارلێکردن لەم بەردە ئاگرینە، لە ئاکامدا بە تێپەڕبوونی ماوەیەکی درێژخایەن خاك و خۆڵ هاتەکایەوەو لەسەر ڕووی زەوی جێگیربوو، ئەو کاتە زەوی گەیشتە قۆناغێك و بارودۆخێکی لەبارو گونجاو کە ڕووەك و گیانداران بتوانن تێیدا بژین، بەڵام دوای ئەم قۆناغە زەوی بە بارودۆخێك و کەشوهەوایێکی زۆر سارد تێپەڕبووە ئیدی سەرجەم گۆی زەوی بووەتە بەفرو بەستەڵەك و شەختەو سەهۆڵ، لە ئەنجامدا زۆربەی هەرەزۆری گیاندارانی ئەو سەردەمەی پێش ئەم بارو دۆخە بەهۆی سەرماو سەهۆڵ گیانیان لە دەستداوەو لەناوچوونە، ئێستاش هەندێ جار لێرەو لەوێ شوێنەواریان بەدەردەکەوێت.

دوای نەمانی ئەم بارودۆخەو ئۆقرەگرتن و سرەوتنی کەشوهەوا، زەوی دووبارە بوژایەوەو ژینگەیەکی لەبارو گونجاو بۆ گیانداران هاتە ئاراوە تا بتوانن تێیدا بژین، ئەو کاتە پەروەردگاری مەزن و کاربەجێ ویستی وابوو مەردم بێنێتەکایەوەو دروستبکات، بەڵام لەسەرەتادا فریشتەکانی لەهێنانەکایەی ئەم بوونەوەرە نوێیەدا ئاگادار کردەوە، هەروەها پێیڕاگەیاندن زەوی ئاوەدان دەکاتەوە، هەروەکو فەرموویەتی:

﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾

واتە: موحەممەد(درودی خودای لەسەربێت) بیریان بخەرەوە کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی گوت من جێنشینێك لەزەوی دادەنێم، فریشتەکان گوتیان ئایا یەکێك لە زەوی دەکەیتە جێنشین و دادەنێیت کە تاوان و خراپەکاری تێدا ئەنجامبدات و خوێنی تێدا بڕێژێت، لە کاتێکدا ئێمە سوپاس و ستایشی تۆ دەکەین و تۆ بەپاك و بێگەردو بە گەورەو مەزن دەزانین و دووری لە هەموو کەموکورییێك وکاری ناشایستە لەبەرتۆ خۆمان لەتاوان دوورخستۆتەوە خۆمان پاك ڕاگرتوە، خودا فەرمووی ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

فریشتەکان گوتیان ئایا جێنشینێك لە زەوی دادەنێیت تاوانی تێدا ئەنجام بدات و خوێنی تێدا بڕێژێت!؟، بێگومان ئەمە چاکترین بەڵگەیە کەوا پێش ئادەمیزاد بوونەوەرو گیانلەبەری دیکە لەسەر ئەم زەویە هەبووەو ژیاوە، چونکە ئەگەر پێشتر لەسەر ئەم زەویە تاوان و خراپەو خوێنڕشتن ڕوویینەدابێت، فریشتەکان چۆن زانیان ئادەمیزاد ئەم جۆرە کارانە ئەنجامدەدات، بەڵام وەك ئاشکرایەو لە مێژوو باسکراوە چۆن بەهۆی کارەسات و نەهامەتی و بەفرو بەستەڵەك هەمووی قڕیووەو لەناوچووە.

بێگومان هەروەکو لەپێش ئێستا ئاماژەمان بۆ نهێنییێك کرد کە هاتنەکایەی مەردم و ئاوەدان کردنەوەی زەوی لەم سات و کاتەدا ، تەنیا لە زانستی لەبن نەهاتووی پەروەردگاری کاربەجێدا هەیە، هیچ زانایێك و بوونەوەرێك بۆی نیە بزانێت ئایا پەروەردگار بۆچی لەم کاتەدا ئادەمیزادی دروستکردوە؟ بۆچی زووتر یان لەدوای چەند سەد یان هەزار بگرە ملیۆنەها ساڵی تر دروستی نەکرد؟، ئەمە نهێنییێکە

هەتا ئەم گەردوونە کۆتایی دێت و لەناو دەچێت هەرگیز ئاشکرا نابێت، زانست و زانیاری مرۆڤ تا کۆتایی ژیان ناگاتە ئەو ئاستە بتوانێت یەك تۆزقاڵ لەم نهێنیە بکات.

**جێنشین پێویستە چۆن بێت؟:**

ئادەمیزاد بوونەوەرێکی رێزدارە بۆیە پەروەردگاری مەزن کردوویەتیە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، هەروەك لە ئایەتە پیرۆزەکەی رابردوو فەرموویەتی جێنشینێك واتە(خەلیفەیەك) لەزەوی دادەنێم، کەواتە ئێمە جێنشینی خوداین لەسەر ئەم زەویە، بێگومان لەسەر جێنشین پێویستەو دەبێ هەمیشە لە هەموو بارودۆخێکدا فەرمانەکانی سەرووی خۆی جێبەجێ بکات، کەواتە ئەم رێزلێنانەی خودا بۆ ئادەمیزاد دوولایەنی هەیە:

یەکەمیان: بۆ تاقیکردنەوە.

دووەمیان: بۆ پێ سپاردنی ئەرك.

ئەگەر بێتو ئادەمیزاد فەرمانەکانی خودای مەزن جێبەجێ بکات و ملکەچ بێت، ئەو کاتە دیارە بەراستی جێنشینە، بەڵام ئەگەر هاتوو سەرپێچی لە مەرجەکانی جێنشینی کرد، واتە مل کەچ نەبوو بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودای مەزن بێگومان ئەو کاتە مەرجەکانی جێنشیبوون لەدەست دەدات و بەمرۆڤێکی تاوانبارو خیانەتکار دادەنرێت، بۆ نموونە:

(یەکێك ئەگەر متمانەی بەکەسێك کرد و رێزی تایبەتی بۆی هەبوو، وێرای ئەم رێزگرتن و متمانەیەش چەند کارێکی پێبسپێرێت تا ئەنجامیان بدات و جێبەجێیان بکات، لەهەمان کاتدا پێیرابگەیەنێت کە ئەگەر ئەم ئەرك و کارانە ئەنجام بدەیت و جێبەجێیان بکەیت، ئەوا لەلای خۆم شوێنی تایبەتیم بۆت ئامادەکردوە، تا هەمیشە لەخۆم نزیك بیت و ببیتە یەکێك لە خۆشەویستانی من، بەڵام ئەو کەسە بێباکانە ئەو کارانە ئەنجام نەدات و هیچ بایەخی بەم متمانەیە نەدا، بێگومان

ئەوكاتە كەسايەتيەكەی لەدەست دەدات، پلەو پايەی ڕێزو خۆشەويستيەكەی كەم دەبێتەوە). لەچەند دێڕێكی دواتر دێينەوە سەر ئەم باسە.

**ئايينی ئيسلام گونجاوترين ئايينە بۆ هەموو سەردەمێك:**

لەبەشەكان و لاپەڕەكانی ڕابردوو لەماناي ئايەتی(٥٦)لەسورەتی(الذاريات) گوتمان خودای بەرزو بالادەست ئادەميزادی بۆ خودا پەرستی و بەندايەتی دروستكردوەو هێناوەتەدی، جا بۆ ئەوەی ئادەميزاد بزانێت چۆن و بەچ شێوەيەك و بەچ جۆرێك يان بەچ ڕێگايەك ئەم خوداپەرستيە ئەنجامبدات و جێبەجێی بكات، پەروەردگاری مەزن لەڕێگای پێغەمبەرەكانەوە(سلاوی خودايان لێبێت) ڕێنمايی ئادەميزادی كردوە، چۆن لەڕێگای ئەم پياوە بەڕێزو ڕاستگۆو پيرۆزانەوە چەندين ئايينی بەپێی پەيامێك و بەرنامەيەكی تۆكمەو داڕێژراو و بێ كەموكوڕی ناردوە، تا سەرجەم ئەو كەسانەی پەيامەكە دەيانگرێتەوە ئەو ئەركانەی لەپەيامەكەدا هاتوە جێبەجێی بكەن، بۆ ئەوەی متمانەی جێنشينی بەدەست بێنن و لە پەروەردگاری خۆيان نزيك ببنەوە.

ئايينەكان يەك لەدوای يەك بەپێی پێشكەوتنی باری كۆمەلايەتی و ئابووری و زانستی و ڕۆشنبيری و تەكنەلۆژی و .... هتد، پەيامەكەو بەرنامەكەيان دەگۆڕا، تەنانەت لە كۆتاييدا گەيشتە پەيامی پيرۆزی ئيسلام، لەبەر ئەوەی موحەممەد دواترين و كۆتايی هەموو پێغەمبەرانە(درودو سلاوی خودا لەسەر ئەو و هەموو پێغەمبەران بێت)، بۆيە دەبينين پەيام و ئايينی ئەو لەگەڵ هەموو كات و سات و سەردەمێك دەگونجێت، هەرگيز نابێتە ئاستەنگ و كۆسپ و تەگەرە لەبەردەم گۆڕانكاری و پێشكەوتنەكانی ژيان، بەڵكو بەپێچەوانەوە چارەسەری سەرجەم كێشە و گيرو گرفت و نەهامەتيەكان دەكات لەهەموو كۆمەڵگايەك و بوارەكانی ژياندا زانستی، كۆمەلايەتی، ئابووری، سياسی، دادوەری، سەرەڕای پاراستنی

سەرجەم مافەکانی تاکەکانی کۆمەڵ پیرو پەککەوتەو منداڵ،نێر و مێ،گەورەو بچووك...هتد.

**پەیامی ئایینەکان دوو تەوەری گرتۆتەخۆی:**

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە ناوەرۆکی سەرجەم ئایینە ئاسمانیەکان بەتایبەتی ناوەرۆکی ئایینی پیرۆزی ئیسلام،دەبینین بەشێوەیەکی گشتی خوداپەرستی تێیدا بریتیە لە دوو تەوەری سەرەکی:

تەوەری یەکەم: بریتیە لە پەیوەندی نێوان بەندەو پەروەردگار، وەك: نوێژکردن، ڕۆژووگرتن، حەجکردن، سەروماڵ بەختکردن لەپێناوی خواداو.....هتد.

تەوەری دووەم: بریتیە لە پەیوەندی نێولن بەندەو کۆمەڵگا، وەك: خۆپاراستن و نەکردنی درۆ، دووزمانی، کوشتن، داوێنپیسی، دزی، داگیرکردنی ماڵ وسامان، فێڵکردن لە کێشان و پێوان و.....هتد.

بەڵام بۆ تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندن و لەیەك جیاکردنەوەی ئەو کەسانەی ئەرکە ئاینیەکان جێبەجێ دەکەن لەگەڵ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمن و گوێڕایەڵنین، پەروەردگاری مەزن و کاربەجێ حەزو ئارەزوویێکی یەکجار بەهێزی خستۆتە ناو دڵ و دەروونی ئادەمیزاد، بەتایبەتی سەبارەت بە پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیان هەروەکو فەرموویەتی:

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴾

واتە: حەزو ئارەزو بۆ ژنان و وەچەی کوڕو سامانی زۆرو کۆکراوە لە زێڕو زیو و ئەسپی چاك وڕەسەن وئاژەڵ وماڵات وزەوی کشتوکاڵی(کێڵگە)بۆ خەڵك ڕازاوەتەوە

ئەوانە هەموویان ڕابواردن و خۆشی و نازی ژیانی ئەم جیهانەن چاکترین نازو بەخشش و خۆشی لای خودا ئامادەکراوە بۆ پێشوازی کردن لە مرۆڤی چاك.

پەروەردگاری مەزن لێرە ئاگادارمان دەکاتەوە تا بەدوای ئەوشتە ڕازاوانەدا نەکەوین تاکو خودامان لەبیر نەچێتەوە، چونکە ئەو ژیانەی ئێستامان ماوەیەکی دیاریکراوی بۆ داندراوە، دوای تەواوبوونی ماوەکە ئیتر دەگەڕێینەوە لای خودای بالادەست، بۆیە پێویستە لەسەرمان هەمیشە هەوڵبدەین بەڵکو دوای گەڕانەوەمان بۆلای خودا جێگای ڕازاوەمان بۆ ئامادە کراوبێت لە ئاکامی ئەنجامدانی کردەوەی چاك لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا و خوداپەرستی.

چونکە جگە لەمە سەیرکە خودای مەزن چی فەرمووە:

﴿ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾

واتە: مەگەر ئەمانە هەمووی لە خۆشگوزەرانی ژیانی ئەم جیهانە بەملاوە چیتر نیە لە کاتێکدا کە ژیانی پڕ لەخۆشی و بەختەوەری نەبڕاوە لای پەروەردگارت بۆ خوداناسان و خوداپەرستانە.

بۆ ئەوەی ئێمەی ئادەمیزاد هەمیشە سەرقاڵی ئەم شتە ڕازاوانەی ژیان نەبین، بەڵکو خەریکی خودا پەرستی بین، دەبینین خودای مەزن لەسەر زاری هەموو پێغەمبەرەکان (سڵاوی خودایان لێبێت) ئاگادارمان دەکاتەوە تا خەریکی ژیانی ئەم جیهانە کۆتایی هاتوە نەبین، چۆن ماوەیەکی کورتەو دەبڕێتەوە، بەڵکو ژیانی بێ کۆتایی و هەمیشە لەبن نەهاتوو دوای زیندووبوونەوە دەستپێدەکات، کەواتە پێویستە خۆمان بۆ ئەوێ ئامادە بکەین.

**پەری و شەیتان کاریگەریان لەسەر ئادەمیزاد هەیە:**

سەرەڕای ئەمەی ڕابردوو، بۆ مەبەستی تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندن و دەرکەوتنی کارچاکان و مرۆڤی خوداناس، خودا توانای لەخشتەبردن و خەڵەتاندنی ئێمەی

بەخشیوە بە(پەری و شەیتان)، واتە دەتوانن کاریگەری لە دڵ و دەروونی ئێمەی ئادەمیزاد بکەن، بێگومان لەسەرەتای دروستبوون و هاتنەدی مرۆڤی یەکەم واتە ئادەمی باوکمان(سلاوی خودای لێبێت)، دوای ئەوەی خودا گیانی خستە ناو جەستەیەوە، پەروەردگاری کاربەجێ ویستی پلەو پایەی ئەم بوونەوەرە نوێیە بەرز ڕابگرێت، بۆیە فەرمانی بە فریشتەکان کرد تا کڕنووشی ڕێزو پایەداری بۆ ئادەم بەرن، ئیدی هەموو فریشتەکان کڕنووشیان برد تەنیا(ئیبلیس) نەبێت کە بە شەیتان ناسراوە سەرپێچی لە فەرمانی خودا کردو کڕنووشی بۆ ئادەم (سلاوی خودای لێبێت) نەبرد، لە ئەنجامی ئەم سەرپێچیە خودای مەزن نەفرەتی لە ئیبلیس کردو لەناو نازو خۆشیەکانی بەهەشت دووری خستەوە، ئیتر لە ئاکامدا ئیبلیس ئادەم و نەوەکانی بە گەورەترین دوژمن و ناحەزی خۆی دەزانێت، بێگومان ئەم باسەو بەسەرهاتە لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، هەروەك خودای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي
فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ
مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ
مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ
رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ
فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ
﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾

واتە: پەروەردگاری تۆ(موحەممەد دروودی خودای لێبێت) کاتێ بە فریشتەکانی گوت من مەردمێك لە قوڕ دروستدەکەم، جا کاتێ تەواو دروستمکرد و گیانم

خستەبەر ئەوا ئێوە كڕنووشی ڕێزلێنانی بۆ بەرن، بۆیە سەرجەم فریشتەكان كڕنووشیان برد تەنیا(ئیبلیس)نەبێت خۆی بەگەورەزانی بەم سەرپێچیەی گومڕابوو بوە گاور، پەروەردگار فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی وایلێكردووی قەدەغەبێت لە كڕنووش بردن بۆ ئەم بەندەیەی من كە دروستم كردوەو دامهێناوە، ئایا خۆت پێ گەورەترەو مەزنترە یان خۆت بەلاوە بەرزو بڵندە، ئیبلیس گوتی: من چاكترم لە ئەو، منت لەئاگر دروستكردوە ئەو لەقوڕ،پەروەردگار فەرمانی پێیكرد لە بەهەشت دەربچێت، چونكە نەفرەتی لێكرا لە بەزەیی و بەخشندەیی ئەو دوورخرایەوە تا ڕۆژی لێپرسینەوەو زیندووبوونەوە، ئیبلیس كاتێ بینی بەهۆی ئەم بوونەوەرە نوێیە پەروەردگار ڕقی لێیهەڵساوەو لەبەهەشت دەریكرد، گوتی: پەروەردگار لەناوم مەبەو مەمفەوتێنە تا ڕۆژی زیندووبوونەوە، پەروەردگار داواكەی جێبەجێ كرد فەرمووی تۆ لە نەفەوتاوەكانی تا ڕۆژی دیاریكراوی داواتكرد، ئیبلیس سوێندی خوارد بە گەورەیی و هێزو تواناى لەبن نەهاتوی خوداوە كە هەموو مەردمێك لە خشتە دەبات لە ڕێگای ڕاست لایان دەدات تەنیا دەسەڵاتی بەسەر ئەو بەندانەدا نیە كە دڵ و دەروونیان پاكوبێگەردە مەبەستیان لە هەموو كارو كردەوەیەكدا تەنیا ڕەزامەندی خودایە.[٢]

كەواتە(شەیتان) هەمیشە خەریكی لەخشتەبردن و گومڕاكردنی ئێمەی ئادەمیزادە، هەوڵ دەدات تا سەرپێچی لە فەرمانەكانی خودای بەرزو بالآدا بكەین، زۆر بە دژواری دوژمنایەتیمان دەكات، لە هەمووی سامناكتر ئەوەیە ئێمە ئەو نابینین، بەڵام ئەو ئێمە دەبینێت، چاكترین سەنگەرو قەڵغانی بەرگریكردن و خۆ ڕزگاركردن لە پیلانەكان و داوی ئەم دوژمنە پابەندبوونمانە بە فەرمانەكانی خودای مەزن،

---

[٢] لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە ئیبلیس پەریە واتە(جن)ە، چونكە پەری لەئاگر دروستكراوەو فریشتەش لە ڕووناكی، وێڕای ئەمەش سەرپێچی لە فەرمانی پەروەردگار كردوە، ئەگەر فریشتە بوایە هەرگیز سەرپێچی لە فەرمانی پەروەردگاردا نەدەكرد، چونكە فریشتە بۆیان نیە سەرپێچی بكەن.

بۆیە پێویستە بەپێی قورئانی پیرۆز و فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت)ڕەفتار و هەڵسوکەوت بکەین تا دەسەڵاتی بەسەرماندا نەمێنێ.

**پایەکانی خودی ئادەمیزاد بۆ نزیك بوونەوە لە پەروەردگار:**

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ئادەمیزاد، دەبینین دڵ و دەروونی یان چاکتر وایە بڵێین خودی ئادەمیزاد هەمیشە خۆی لە چوار پلەو پایەدا دەنوێنێت، ئێمە بۆ ئەوەی چاکتر بچینە ناو بابەتەکەو ئاسانتر تێیبگەین دەتوانین ئەم پلەو پایانە وەك پایەکانی پەیژە بێنینە بەرچاومان کە لەخوارەوە دەست بە پۆلێن کردنیان بکەین:

١- پایەی ئاگر.

٢- پایەی خاك یان قوڕ.

٣- پایەی ڕووناکی.

٤- پایەی گیانی(ڕۆحی).

١- پایەی ئاگر:

دەکەوێتە ژێر هەموو پایەکان، سەرجەم ڕەفتارو کردەوەکانی تایبەتمەندن بەحەزو ئارەزووەکان و برسیەتی و تووڕەبون و هەڵچوون و ڕقوقینەو چاوپیسی و فروفێڵ و ساختەکاری لە ئادەمیزادا سەرچاوەکەی لەم پایەدا سەرهەڵدەدات و تۆقرە دەگرێت.

٢- پایەی خاك - قوڕ:

دەکەوێتە نێوان پایەی ئاگرو پایەی ڕووناکی، واتە لەسەرووی پایەی ئاگرەوەیەو لە ژێر پایەی ڕووناکیدایە، سەرجەم ڕەفتارو کردەوە میکانیزمیەکان و دووبارە بوونەوەو تەمبەڵی و سستی و کەمتەرخەمی و پێنەکران و نەتوانین و داتەپیوی و لاشەقورسی لە ئادەمیزادا لەم پایەدا سەرچاوەو تۆقرە دەگرێت.

٣ـ پایەی ڕووناکی:

لەسەرووی پایەی خاکدایە، سەرجەم ڕەفتارو کردەوەکانی لێخۆشبوون و لێبوردن و بەخشین وهێمنی ولەیەککەیشتن وهەست و سۆزکردن لەم پایەدا ئۆقرە دەگرێت.

٤ـ پایەی گیانی(ڕۆحی):

لە سەرووی هەموو پایەکانە،سەرجەم ڕەفتارو کردەوەکانی سەربەستی وپەڕینەوە بۆ دۆخی سازگاری وبێگەردی وداهێنان وئەندێشەو جوانی لە ئادەمیزادا لەم پایەدا سەرچاوە دەگرێت.

لێرە مەبەستمان ئەوەنیە کە جەستەی مرۆڤ ئەم پایانە دێنێتەدی و دروستیان دەکات، بەڵکو جەستە تەنیا توانای سەرکەوتنمان پێ دەبەخشێت تا بۆ پایەکان سەربکەوین یان دابیەزین، بەڵام هەر یەکێك لە ئێمە چ پایەکی بیەوێت دەتوانێت بەپێی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی لەم پایەدا سەقامگیر بێت، چونکە مرۆڤ هەمیشە سەربەست وئازادە لە هەڵبژاردنی ڕێگای ژیانی، بۆیە هەر یەکێك لە ئێمە مەبەستی کامە پایەبێت ئەوا دەتوانێت بێ هیچ فشارێکی دەرەکی لەو پایەدا بسرەوێت و ئۆقرە بگرێت، بەڵام ئەو کەسانەی هەمیشە دوودڵن و ڕاڕان لە ژیاندا، بێگومان ئەوا لە هیچ پایەیەك ئۆقرە ناگرن بۆیە بەردەوام لە هەڵکشان و داکشان و دابەزین و سەرکەوتندان لە نێوان پایەکاندا.

ئەگەر ئێمە بەووردی و بابەتیانە سەرنج بدەین، یان بە ویژدانەوە هەڵسەنگاندنێك بۆ خودی خۆمان بکەین، ئەوا دەبینین چۆن ڕۆژانە بە بەردەوامی لەم پایانەدا سەردەکەوین و دادەبەزین، چۆن هەندێ کات بە ویژدانەوە سەیری دەوروبەرمان دەکەین، هەندێ کاتیش بەدوای حەزو ئارەزووەکانماندا دەکەوین، کەچی هەندێ کاتی تر دەچینە بارودۆخێکی دیکە بەپێی هۆش و عەقڵ ڕەفتار دەکەین ئیدی خۆمان لە بارودۆخی سازگاری و بێگەردی و سەربەستیدا دەبینینەوە، کەواتە ئێمە هەرگیز لەیەك پایەدا ئۆقرە ناگرین.

بۆیە لێرەدا دەتوانین بڵێین بەداخەوە ژمارەی ئەو کەسانەی لەپایەی گیانیدا واتە (ڕۆحیدا) ئۆقرە دەگرن و دەمێننەوە زۆر کەمە، چونکە دەگمەنن ئەو کەسانەی نەکەوتبنە بەر بەرداشی حەزو ئارەزوو برسیەتی و ژیانی ماددەپەرستی نەیهاڕیبن، بەڵام دەبینین ژمارەی ئەو کەسانەی لە پایەی ئاگردان یەکجار زۆرە، بێگومان ئەم پایەیە ئەو جۆرە کەسانە دەگرێتەخۆی کە بەدوای حەزو ئارەزوو ڕابواردن و خواردن و خواردنەوە کەوتوون، تەنیا خەفەت و غەم و پەژارەی هەرە گەورەیان سك و دامێنیانە.

هەندێکی تر لەنێوان پایەی ڕووناکی و ئاگردا سەردەکەون و دادەبەزن، ساتێك لە پایەی ڕووناکین تاوێکی دیکە دادەبەزن بۆ پایەی ئاگر، ئیتر ئارام و ئۆقرەیان نیە، دەیانەوێت خۆیان لە خەڵەتاندن و لە خشتەبردن یان لە داوێك ڕزگار بکەن کەچی دەکەونە ناو داوێکی دیکە.

لەلاپەڕەکانی ڕابردوودا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە ئادەمیزاد لەخاك دروستکراوە، هەروەها شەیتان لە ئاگر دروستکراوە، ئینجا سەیرکە تا ئادەمیزاد نەچێتە پایەی ئاگرەوە شەیتان ناتوانێت لەخشتەی بەرێت، چونکە کاتێ دەچێتە پایەی ئاگرەوە ئەو کاتە هاو چەشنی و هاوشێوەیی لە ڕەگەزەکان پەیدا دەبێت ئینجا شەیتان دەتوانێت دوودڵی و بخاتە نێو دڵیەوەو کاریگەری لەسەر مرۆڤەکە هەبێت.

کەواتە هەر کاتێك ئادەمیزاد دابەزیە خوارەوە بۆ پایەی ئاگر واتە بۆ پایەی(حەزو ئارەزوو برسیەتی و هەڵچوون و تووڕەبوون و ڕقوقینەو ساختەکاری و فڕوفێڵ و چاوپیسی و چاوچنۆکی) ئەو کاتە شەیتان بۆی هەیە کاریگەری خۆی بخاتەسەر، چونکە هاوڕەگەزی لە نێوانیاندا پەیدا دەبێت، بۆ نموونە:

(کاتێ یەکێك تووڕەدەبێت ئائەوکاتە شەیتان مەشخەڵی تووڕەییەکەی بەهێزترو گەشەتر دەکات تا تاوان و شەڕو کوشتارو کاری ناڕێك و ناشیرین ئەنجام بدات، یان

ئەگەر یەکێك بیر لە ڕابواردن بکاتەوە ئیتر شەیتان حەزو ئارەزووەکانی بەگڕتر دەخات بۆ ئەوەی تاوان و کردەوەی قێزەون و ناشیرین ئەنجام بدات).

هەروەکو لەبەشەکانی ڕابردوو باسمان کرد ئێمەی ئادەمیزاد سەربەست و ئازادین لە هەڵبژاردنی ڕێگای خوداپەرستی و ئەنجامدانی ڕەفتارو کردەوەی چاك، کەواتە دەتوانین هەوڵبدەین ویگەین بەپایە بەرزەکان، هەروەها لە هەمان کاتدا سەربەست و ئازادین لە ئەنجامدانی کارو کردەوەی نابەجێ و تاوان، تەنانەت دەتوانین ئەوەندە دابەزینە خوارەوە تا لە پایەی مرۆڤایەتی دەردەچین و ئاژەڵ ئاسا ڕەفتار دەکەین لە گەڵ دەوروبەرو کۆمەڵگادا.

بۆ نموونە:(کاتێ یەکێك لە هاوڕێکانمان یان برا و خوشکانمان هەڵەیەك بەرامبەر بە ئێمە بکەن، بێگومان ئێمە دەتوانین بە هێمنی و ئارامی ڕەفتار بکەین و بیبەخشین و لێیببوورین، لەهەمان کاتدا دەتوانین توندو تیژو دڵڕەقبین تۆڵەی لێبکەینەوە).

کەواتە ئێمەی ئادەمیزاد دەتوانین هەموو پایەیەك جێبهێڵین و ئاژەڵ ئاسا ڕەفتار بکەین هەمیشە بەدوای دژایەتی و تۆڵەسەندنەوە بکەوین هیچ جۆرە بەزەییێك و سۆزێکی مرۆڤایەتیمان نەمێنێت.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾

واتە: ئەوانە وەك ئاژەڵن بەڵکو لە ئاژەڵ کەمترن چۆن ئەوانە بێ ئاگان.

﴿ إِنۡ هُمۡ إِلَّا كَٱلۡأَنۡعَٰمِۖ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ ﴾

واتە: بەڕاستی ئەوانە تەنیا وەك ئاژەڵن بەڵکو گومڕاترو کەمترن.

ئەمجۆرە کەسە لەپایەکانی ژێرەوەدایەو هەمیشە شەیتان ڕاوێژکاریەتی و سەرپەرشتیاری ڕەفتارەکانیەتی هەروەکو خودای مەزن فەرموویەتی:

﴿ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾

واته: ئەوانە پشتیان لەخودا کردوە شەیتانیان کردوەتە سەرپەرشتیارو هەڵسوڕێنەری کارەکانیان.

ئادەمیزاد سەرجەم گەردوون دەگرێتەخۆی، بۆیە هەندێ لە زانایان دەڵێن ئادەمیزاد (کتێبە)،چونکە هەموو بوونەوەرێکی دیکەی ئەم گەردوونەی لە هزرو مێشکدا کۆکراوەتەوە، هەریەك لەم بوونەوەرە کۆکراوانە وەك (ئاسمان، زەوی،.....هتد)، لاپەڕەیکی کتێبەکەن، ئیتر سەبارەت بەم ڕێزگرتنەیەبوو پەروەردگاری مەزن و دانا فەرمانی بە فریشتەو ئیبلیس کرد تا کڕنووشی ڕێز بۆ ئەم بوونەوەرە ببەن.

سەرەڕای ئەمە پەروەردگاری کاربەجێ سەرپەرشتی و ڕێنمایی کردنی ئادەمیزادی بەهیچ بوونەوەرێك نەسپاردوە،بەڵکو ڕاستەوخۆ لە میانەی پێغەمبەران(سڵاوی خودایان لێبێت) و کتێبە پیرۆزەکانیانەوە، بەشێوەیەکی هێمن و ئازاد و سەربەستانە ئاراستەی ڕێگای دروست و ڕاست و ڕەوامان دەکات، تەنانەت لە کۆتاییدا پاداشت و سزامان بۆ ئامادە بکات، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ﴾

واتە: بەبەزەیی خوداوە تۆ بۆ موسلمانان نەرمونیانی وە ئەگەر قسەت ناخۆش و دڵ ڕەق بوویتایە ئەوا پەرتەیان دەکرد لە چواردەورتا، لێیانببورەو لێیانخۆشبە و ڕاوێژیان پێ بکە لە کارەکاندا.

﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾

واتە: هەر پێغەمبەرێکمان بە زمانی میللەتەکەی خۆی ناردوە بۆیان تا ئایین و بەرنامەی خودایان بۆ ڕوون بکاتەوەو تێی بگەن.

ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکە هەندێ لە زانایانی زانستی سۆفی گەری خودی ئادەمیزادیان دابەش کردوە بۆ حەوت جۆر :

١ـ خودی فەرماندار(النفس الامارە):

خودی ئەمجۆرە کەسە هەمیشە بۆلای جەستەو لاشەکەی دەچێت و لار دەبێتەوە، فەرمانی پێدەکات تا بەشوێن حەزو ئارەزووەکانیدا بچێت، دڵ و دەروونی هەمیشە بەرەو پایەکانی خوارەوەی دەبەن کەپایەی ڕەفتارو کردەوەی ناشیرین و کاری خراپەیە، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴾

واتە: خودی مرۆڤ فەرمان بە خراپە دەکات (ئەگەر بیرو باوەڕو عەقڵ سەرکێشی نەکەن بۆلای کاری چاکەو خوداپەرستی).

٢ـ خودی سەرزەنشتکار(النفس اللوامە):

خودی ئەمجۆرە کەسە کاتێ جلەوی لەدەست عەقڵیدابێت تروسکایی هیوایێك و ڕووناکی تێدا بەدیدەکرێت،بەڵام هەندێ جار سەرپێچی لەعەقڵ دەکات یاخیدەبێت و بەدوای حەزەکانیدا دەچێت، دواتر پەشیمان دەبێتەوە سەرزەنشتی خۆیدەکات، گلەیی و گازاندە لە خودی خۆی دەکات، هەروەها خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ۝٢ ﴾

واتە: وەسوێند ناخۆم بەم خودانەی، یان سوێندم بەم خودانەی کە سەرزەنشتی خۆیان دەکەن و گلەیی لە خۆیان دەکەن.

٣ـ خودی ئارامگر، سرەوتو، ئۆقرەگرتو(النفس المطمئنة):

خودی ئەمجۆرە کەسە ڕووناکیێکی سازگارو بێگەردی تێدایە، چونکە گەیشتۆتە پایە بەرزەکان و لەوێ ئۆقرەی گرتوە، بۆیە هیچ بوارو دەرفەتی ڕەفتاری ناشیرین و نابەجێی بۆ نیە، بەڵکو هەمیشە مەستبوە بەم ڕووناکیەی پێی بەخشراوەو ئۆقرەو ئارامی پێیەوە گرتوە، خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ ﴾

واتە: لەسەرەمەرگدا، بە باوەڕداران دەگوترێت:ئەی خاوەنی خودو دڵ و دەروونی پڕ لە ئۆقرەو ئارام و سرەوتوو بە ڕەزامەندیەوە بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت کەتۆی قایل کردوەو ئەویش لەتۆ قایلەو ڕەزامەندە، واتە:(ڕازیە بەم پاداشت و بەخششەی لەلایەن خوداوە پێیدراوەو لە ڕۆژی دواییشدا پێیدەدرێت).

٤ـ خودی سروشکراو، ئیلهامکراو(الملهمە):

خودی ئەمجۆرە کەسە، لەلایەن پەروەردگارەوە زانست و دڵفراوانی و ملکەچی و قەناعەتی بە سروش پێ بەخشراوەو خراوەتە ناو دڵ و دەروونیەوە، ئیتر بۆی بووەتە سەرچاوەی ئارامی و ئۆقرەگرتنی، بیرو هۆشی، قسەو ئاخاوتنی، لە سوپاس و ستایشی پەروەردگاردایە، هەمیشە زۆر هێمن و لەسەرخۆیە، هەروەها لە قورئاندا هاتووەو فەرموویەتی:

﴿ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴿٨﴾ ﴾

واتە: پەروەردگار توانای خراپەو چاکەی تێدا دابینکردوەو پێیبەخشیوە.

٥ـ خودی قایلبو،ڕازیبو(الراضیة):

خودی ئەمجۆرە کەسە هەمیشە لە هەموو بارودۆخێکدا لە خودای بەرزو باڵادەست ڕازیە، جا چ لە شادی و کامەرانیدابێت، یان لەکارەسات و نەهامەتیدابێت، لە خۆشگوزەرانی یان لە قاتوقڕی دابێت، تەنانەت لە دەربەدەری و ئاوارەیی و نامۆییدا هەمیشە لەخودای کاربەجێ ڕازیەو بەهەموو شێوەیەکی ژیان قایلە، چونکە بەمانای خۆدانەدەست خۆی داوەتە دەست خودا، ئەمجۆرە کەسە یەکجار هێمن و سەرسام و کپ و بێدەنگە، هەردەم لەبیرکردنەوەدایە، هەروەکو لە ئایەتی (٢٨)ی سورەتی(الفجر)، لە خاڵی (٣)ی سەرەوەدا هاتووە.

٦ـ خودی لەخوداڕازی و خودا لەئەو ڕازی(المرضیة):

خودی ئەمجۆرە کەسە، چۆن ئەو لە خودا ڕازیە، خودای مەزنیش لە ئەو ڕازیە، شوێنەوارو کاریگەری ئەم ڕەزامەندیەی خودا کاردانەوەی لەسەر کەسایەتیەکەی دیارە چۆن دەبێتە خاوەن ڕێزو پلەو پایەی بەرز، خودی ئەمجۆرە کەسە تەنانەت بۆ یەك چرکە خودایان لەبیر ناچێتەوەو بێ ئاگانین،تەنانەت هەر کارو کردەوەیەکی ئەنجامی بدات تاکە مەبەست و هیوای تێدا ڕەزامەندی خودایەو هیچی تر نا. وەکو لە ئایەتی (٢٨)ی سورەتی (الفجر)، لە خاڵی(٣)ی ڕابردوودا هاتووە.

٧ـ خودی تەواو(الکامل):

خودی ئەمجۆرە کەسە، لە هەموو جۆرە کارێك و ڕەفتارێکی بێ کەموکوڕیە، گەیشتۆتە تەواوسازی، وێڕای ئەمەش هەموو کات و ساتێکی ژیانی لەگەڵ خودای بەرزو مەزندایەو دانابڕێت و جیانابێتەوە، لەژێر سەرپەرشتی و چاودێری خودای مەزن و پڕ دەسەلاتدا دەدوێت و ڕەفتار دەکات، هەست بە ئازارو ئەشکەنجەو مەینەتیەکانی هەردوو جیهاندا ناکات، چونکە ئەم کەسە(وەلیە)، سەبارەت بەم کەسانە خودا فەرموویەتی:

﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾

واتە:ئا ئەوانەی خودا سەرپەرشتیان دەکات واتە(وەلیەکانی خودا) هیچ ترسێکیان لەسەرنیە(لەڕۆژی دواییدا) و هیچ غەمبارنین بۆ ڕابردوویان.

کەواتە پێویستە لەسەرمان، ڕەفتارو کردەوەی نابەجێ و ناشیرین ئەنجام نەدەین، سەرپێچی لە حەزو ئارەزوەکانمان بکەین، بەڵکو خودا یارمەتیمان بدات و بتوانین لەم پلەو پایە بەرزانەدا سەربکەوین و ڕەزامەندی خودای مەزن وبالا بەدەستبێنین، هەروەکو خودای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾

واتە: ئەوەی خودی خۆی پاك ڕاگرت و بەخاوێنی پاراستی، بە خوداپەرستی و بە چاکەکردن گەشەی پێکردو بەرزو پیرۆزی کرد، ئەوا ئەو کەسە هەموو سەرکەوتنێك و داواکارییەك بەدەستدێنێ، وە ئەوەی گوێی پێنەدات و کاری ناڕێك و ڕەفتاری ناشیرین بکات، ئەوا بێ ئومێدو بێ هیوا دەبێت و گومڕادەبێت.

سەرەڕای ئەمە یەکێك ئەگەر خۆی ماندوبکات و هەوڵەکانی بخاتەگەڕ بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو لە ئاکامدا بە ئامانجەکە دەگات، ڕێگای خودا پەرستیش بەهەمان شێوەیە، سەیرکە بزانە چۆن خودا فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ ﴿٦﴾ ﴾

واتە:خودای مەزن بانگەواز بۆ هەموو ئادەمیزادێك دەکات،چونکە(ئینسان)ڕەگەزی ئادەمیزاد دەگرێتەوە، دەفەرمووێت: تۆ بەکردەوەکانت هەوڵدەدەیت تا بگەیتە پەروەردگارت، پێیدەگەیت و کردەوەکانیشت لای ئەو دەبینیتەوە(واتە لەڕۆژی دواییدا).

**خۆشەویستی خودا دژی خۆشەویستی حەزو ئارەزووەکانە:**

ئێمە بەندەی پەروەردگارێکی یەکجار مەزن و باڵادەست و زاناو داناو تواناین، بۆیە دەبێ بەندەیەکی ڕاستەقینەبین، دڵ و دەروونمان جگە لە ئەو هیچ شتێکی دیکەی تێدا نەبێت، هەر کردەوەیەك ئەنجام بدەین لە ژیاندا پێویستە تاکە مەبەستمان تێیدا تەنیا ڕەزامەندی ئەو بێت نەك مەبەستێکی دیکەی ژیان، خۆشەویستی خودای مەزن و پێغەمبەرانی(سڵاوی خودایان لێبێت) دەبێ لە ناو دڵ ودەروونماندا جێگیرو سرەوتوبێت، ئەگەر دڵەکانمان ئەم خۆشەویستیەی تێدا نەبوو سەرجەم کارو کردەوەکانمان بە فیڕۆ دەچێت، چونکە پەروەردگاری کاربەجێ ئەو دڵەی ئێمەی بۆ خۆشەویستی خۆی داهێناوە، ئەگەر بێتو خۆشەویستی ئەوی تێدا نەبوو ئەوا ئۆقرەو ئارامی نامێنێت و هەمیشە پەست و غەمبار و پەشۆکاوە، بێگومان دڵیش وەك ئەندامەکانی تری لەش ئاسا پێویستی بە چارەسەرکردنە، چۆن ئەگەر

چاوەکانمان بینینیان کزو بێهێزبێت، یان ئەگەر گوێچکەکانمان بیستنیان کەم و بێهێزبێت، ئەوا بە ئەندامێکی پەککەوتەو نەخۆش دادەندرێن و پێویستیان بە چارەسەرکردنە، بەهەمان شێوە دڵەکانیشمان ئەگەر بێ ئاگابێت لە پەرستن و خۆشەویستی خودای مەزن، دیارە نەخۆشەو پەککەوتەیە، بۆیە پێویستی بە ئاگاداربوونەوەو هوشیاربوونەوەو چارەسەری هەیە، هەروەها پێویستە بزانین ئێمەی ئادەمیزاد بۆ ئەوە حەزو ئارەزوومان پێنەدراوە تا بەدوای خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن و سامان کۆکردنەوە بکەوین، بەڵکو بۆ ئەوە پێماندراوە تا دایبمرکێنیەوە و بیخەینە ژێر پێمانەوە، تەنانەت وەك پەیژە ئاسا بەرەو پایە بەرزەکان پێی سەربکەوین، چونکە ئەگەر بەدوای حەزەکانی دڵ و دەروونمان بکەوین ئەو کاتە دەبێ پشت لەخودای مەزن بکەین تووشی نە هامەتی و تەنگ و چەڵەمەی ژیان بین، بۆیە دەبینین لەچەندین ئایەتی پیرۆزدا خودای مەزن ئاگادارمان دەکاتەوە تا پشت لە حەزو ئارەزووەکان بکەین و بەرەو لای ئەو بچین، هەروەکو فەرموویەتی:

﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾﴾

واتە: سامان و ماڵ و منداڵ جوانی و ڕازاندنەوەی ژیانی ئەم جیهانەیە(واتە پێیان نەخەڵەتێن) بەڵکو کردەوەو ڕەفتاری چاك و خوداپەرستی چاکترین پاداشتی لای پەروەردگاری تۆ هەیەو چاکترین هیوای هەیە.

ئەگەر بێتو حەزو ئارەزوەکانمان پشت گوێ بخەین، ئەو کاتە پلەو پایەمان زۆر بەرز دەبێتەوە لەخودای مەزن نزیك دەبینەوە، بەڵام پێچەوانەکەی بەپێچەوانەوە دەبێت، ئیتر کۆتایی ئەم بەشە بەم نموونەیە دێنینەوە تا ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ هەموومان:

(ئەگەر لەبەرزاییێك چێشتخانەیەكی زۆر نایاب وبەناوبانگ هەبێت، ئەم چێشتخانەیە بەخۆڕایی چاكترین و پوختەترین خواردەمەنی دابەش بكات، بەڵام بۆ سەركەوتن و گەیشتن بەم چێشتخانەیە پێویستە هەر یەكێك پەیژەیەكی تایبەتی خۆی هەبێت، یەكێك هەندێ دارو كەلوپەلی پەیژە دروستكردنی پێبدرێت تا پەیژەیەك دروست بكات بۆ ئەوەی سەربكەوێت بۆ چێشتخانەكە، كەچی ئەو بچێت دارو كەلوپەلەكان بكاتە سووتەمەنی و ئاگری پێبكاتەوەو بڵێ من بۆخۆم خۆراك دروست دەكەم، سووتەمەنیەكەش تەنیا بەشی یەك ژەمی بكات!)تۆبڵێی ئەو كەسە عاقڵ بێت؟!.

# بەشی پێنجەم

## چی دەزانین دەربارەی مردن و گۆڕ

### یەکەم: مردن:

**ئادەمیزاد کاتی دیارکراوی هەیە:**

**لە بەشەکانی ڕابردوو ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کە پەروەردگاری مەزن و پڕتواناو کاربەجێ جەستەی ئادەمیزادی لە خاك لە(قوڕ) دروستکردوەو هێناوەتەدی، دوای ئەمە گیانی خستەبەر، بەڵام مانەوەی گیان لەناو جەستەی ئادەمیزادا بۆ ماوەیەکی دیارکراوە، خودای گەورەو زانا تەنیا خۆی دەیزانێت ماوەی مانەوەی هەر گیانێك لەناو جەستەکەیدا چەندە، هەروەك لەچەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ ئەمە کردوە، بۆ نموونە:**

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ ﴾

**واتە: ئەو خودایەی ئادەمی باوکتانی لە قوڕ دروستکردوە دوایی هەریەك لە ئێوە لەنەوەکانی ئادەم کاتێکی هەیە بۆ مردن، وەکات و ساتی دانراو تەنیا ئەو خۆی دەیزانێت کەسی تر نایزانێت کە زیندووبوونەوەیە ئێوە لێی بەگومانن.**

**مردن هەموو بوونەوەرێك دەگرێتەوە، چونکە ئەوەی سەرەتاو دروستبوونی هەبێت ئەوا بێ گومان کۆتایی ونەمانیشی هەیە،کەواتە ئەوەی بمێنێت وهەرگیز نەفەوتێت و هیچ گۆڕانکاری بەسەر دانەیەت تەنیا پەروەردگاری مەزن و باڵایە هەروەك فەرموویەتی:**

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٨٨﴾﴾

واتە: هیچ خوداییّك نیە جگە لە خودا بەملاوە بپەرستریّت، هەموو شتیّك لەناو دەچیّت تەنیا ئەو هەمیشەییەو هەر دەمیّنیّت، تەنیا ئەو حوكمڕانی و دەسەڵاتی جیهان و ڕۆژی دوایی لە ژیّر دەستدایەو سەرجەم بوونەوەران دەگەڕیّنەوە بۆلای ئەو.

**مردن چییە:**

ئەو زانیاریانەی ئیّمە لەمەڕ مردنەوە هەمانەو دەیبینین تەنیا دیاردەیەكی فیزیاییە وەك نەمانی جوولە و هەست و هیّزو قسەو هەناسەدان، بەڵام بیّگومان شتیّكی بەڵگە نەویستە و دەزانین ئیّمەی ئادەمیزاد بریتین لە: گیان واتە(ڕوح)، لەگەڵ جەستە، بەڵام ئەوەی بەچاو دەیبینین و دیارە لیّمان تەنیا جەستەكەمانە واتە لاشەكەمانە، چونكە گیانی ئادەمیزاد وەك گیانی سەرجەم بوونەوەرانی دیكە بزرو نادیارە، هیچ پیّناسەیەكیش شیاوی ئەوەنیە یان بگرە كەس بۆی نیە پیّناسەی گیان و هەموو شتە شاراوەو نادیارو بزرەكان بكات یان لەسەریان بدویّت، هەروەكو لە لاپەڕەكانی ڕابردوو گوتمان جیهانی شاراوە(غەیب) هیچ كەسیّك زانیاری و زانستی دەربارەی نیە، چونكە پەروەردگاری مەزن مەبەستی خۆی هەیە لە شاردنەوەی ئەم جیهانە، هەروەكو سەبارەت بە گیان پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي ﴿٨٥﴾﴾

واتە: ئەی موحەممەد(درودی خودای لیّبیّت) پرسیارت دەربارەی گیان لیّ دەكەن، بلّیّ گیان فەرمانیّكە لە فەرمانەكانی پەروەردگارم.

**مردن گواستنەوەیە بۆ جیهانێکی تر:**

دوای مردنمان هەر یەکێك لە ئێمە دەچێتە جیهانێکی نادیارو شاراوە(غەیب)، واتە ئادەمیزاد دەچێتە جیهانێکی تر،بەڵام پەردەیەك لەنێوان ئەو جیهانەکاتیەو ئەم جیهاندا هەیە، هەروەك خودای بەرزو باڵاو پڕدەسەڵات لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾

واتە: خراپە دەکەن تا ئەو کاتەی یەکێکیان مردنی بۆ دێت جێگای خۆی دەبینێت لە دۆزەخدا، ئەو ساتە دەڵێ پەروەردگارە بمگەڕێنەوە تا کاری چاك ئەنجام بدەم ئەو کارانەی پێشتر نەمکردوە بیانکەم،(بەڵام تازە کارلەکار ترازاوە)ئەوە قسەیەکە بۆخۆی وادەڵێت دەبێ چاوەڕێبێت لە نێوان مردن و زیندووبوونەوەدا بەریەستێك و پەردەیەك هەیە تا ڕۆژی زیندووبوونەوەو دیاریکراودا.

کەواتە دوای مردن ئادەمیزاد دەگوازرێتەوە بۆ جیهانێکی دیکە، جیهانێکە لەودیو پەردەوەیەو نادیارە، ئیتر لەم جیهانەی ئەوێ دەمێنێتەوە، تەنانەت ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە، ئەم جیهانەی پشت پەردە بۆ ئادەمیزاد یەکەم هەوارگەی دواڕۆژە، دواترین هەوارگەی ژیانی ئەو جیهانەیە، ئینجا مەرج نیە ئەم شوێنە یان ئەم هەوارگەیە گۆڕێك بێت لەشێوەی چاڵێکی ئاسایی، وەك هەمیشە لە گۆڕستانەکاندا دەیانبینین، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی ئەو هەوارگەیە هەموو شوێنەکان دەگرێتە خۆی، جا قوڵایی دەریابێت، یان ناو سکی شێرو پڵنگ و دڕندەکان بێت، یان لەشێوەی خۆڵەمێشی ناو گڕکان و کوورخانی ئاگربێت، یان هەر شوێنێکی تربێت بەپێی شێوەو ڕێگای مردنی جۆراوجۆری ئادەمیزادەکان.

ژیانی پشت پەردەی نادیارو شاراوە لێمان، بریتیە لە ژیانی جیهانێکی دیکەی ناسراو بە جیهانی سرەوتووی گیانەکان(عالەم ئەلئەرواح)، لەڕێگای مردنەوە نەبێت هیچ یەکێك لە ئێمەی ئادەمیزاد بۆی نیە بگاتە ئەم جیهانە و بیبینێت.

**مردن فەرمانی خودایە:**

مردن و دەرچوونی گیانەکان بە ڕێککەوت و بێ بەرنامە نیە، بەڵکو هەروەك پێش ئێستا ئاماژەمان بۆی کرد هەریەکێك لە ئێمە کاتی دیارکراوی خۆی هەیە، بۆیە کاتێ یەکێك تەمەنی تەواو دەبێت و کاتە دیارکراوەکەی کۆتایی دێت، بە فەرمانی پەروەردگاری مەزن فریشتەی مردن دێتەلای تا گیانی لە جەستەدا دەربکات و جیای بکاتەوە، کەواتە هەموو مردنێك لەدەست پەروەردگار خۆیەتی، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ............... ﴿٤٢﴾ ﴾

واتە: خودا زیندووەکان دەمرێنێت کاتێ ماوەی دیارکراویان دێت بۆ مردن.

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾

واتە: هیچ کەسێك نامرێت تەنیا بە فەرمانی خودا نەبێت کاتەکەی دیارکراوە.

بەڵام لە ئایەتێکی تردا خودا فەرموویەتی:

﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ﴿١١﴾ ﴾

واتە: ئەی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) بڵێ فریشتەی مردن گیانتان دەردەکات ئەو کارەی ئێوە بە ئەو سپێردراوە.

بەڵام ئەگەر بەووردی سەرنجبدەینە ئەم ئایەتە پیرۆزانە، دەبینین لە هەموویان فەرمانی مردنەکە بۆ پەروەردگاری مەزن دەگەڕێتەوە، چونکە لە ئایەتی سێیەمدا تەنیا ئەنجامدانی کارەکە بە فریشتەی مەرگ سپێردراوە نەك فەرمانەکە، بۆ

ئەوەی جیاوازی لەنێوان ئەم ئایەتانە بەدی نەکەین، دوو نموونەی ژیانی ڕۆژانەمان دەخەینە پێش چاو ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٦٠﴾ :

نموونەی یەکەم:(یەکێك کاتێ دەگیرێت ودەست بەسەر دەکرێت، بێگومان فەرمانی گرتنەکەی لە دادوەرەوە بۆ دەردەچێت، بەڵام کاری گرتنەکەی لەلایەن پۆلیسەوە دەبێت، واتە پۆلیسەکە لە خۆیەوە ناتوانێت هیچ کەسێك بگرێت و بەند بکات تەنیا بە فەرمانی دادوەر نەبێت).

نموونەی دووەم:(هەریەکێك کاتێ لەدەزگایەکی فەرمی دادەمەزرێت مووچەکەی بەپێی پلەی خوێندن و بڕوانامەکەی مانگانە بۆی دیارکراوە چەندە، تەنانەت زیادکردنی ساڵانەی ساڵ لەدوای ساڵ لەسەرەتای دامەزراندنیەوە تا ئەو کاتەی خانەنشین دەکرێت دیارکراوە، بەڵام لەگەل ئەوەشدا هەموو مانگێك پێویستەو دەبێ بەڕێوەبەری فەرمانگاکە واژوو لەسەر لیستی مووچەکەی بکات، ئەگینا بەرپرسی مووچەدابەشکردن بۆی نیە مووچەکەی پێبدات، هەروەها سەبارەت بە زیادەی ساڵانەو بەرزکردنەوەی بۆ پلەیەکی تر و چەندین کاری تر بەهەمان شێوە پێویستە بەڕێوەبەر خۆی واژووی لەسەر بکات، کەواتە بەرپرسی مووچە لەخۆیەوە ناتوانێت مووچەی فەرمانبەران بدات، هەرچەندە ئەو کارە تایبەت بەئەوەو بەئەو سپێردراوە).

فریشتەی مردنیش بێ فەرمانی پەروەردگاری مەزن بۆی نیە گیانی هیچ کەسێك دەربکات، بۆیە ماوەی تەمەنەکان تەنیا پەروەردگاری مەزن خۆی دەیزانێت هیچ بوونەوەرێکی لەم نهێنیە ئاگادار نەکردۆتەوە.

## جیوازی نێوان گیان دەرکردنی باوەڕدارو گاوران:

فریشتەکان لەکاتی دەرکردنی گیانی ئادەمیزادا، واتە لەسەرەمەرگدا جیاوازی دەکەن لە نێوان باوەڕداران و ئەو کەسانەی گاورو بێ باوەڕن، هەروەکو لەم ئایەتانەی خوارەوەدا پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾

واتە: تەنانەت کاتێ فریشتە نێردراوەکانمان دێنەلایان بۆ گیان دەرکردنیان پێیان دەڵێن کوا ئەو کەسانەی جگە لە خودا هاناتان بۆ دەبردن، لەوەڵامدا دەڵێن نازانین لێمان وون بوون ئینجا گەواهی لەسەرخۆیان دەدەن کە گاورو بێ باوەڕن.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

واتە:ئەو کەسانەی دەڵێن خودا پەروەردگارمانە پاشان هەمیشە لەسەر ئەم ڕێبازە دەڕۆن، لەسەرەمەرگدا فریشتەکان دادەبەزن بۆلایان و پێیان دەڵێن نەترسن و غەمبارنەبن و موژدەی ئەو بەهەشتەتان لێبێت کە پێشتر بەڵێنتان پێدرابوو.

﴿ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَكُنتُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهِۦ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾

واتە: ئەگەر لەسەرەمەرگدا ئەو ستەمکارانە ببینیت و چۆن فریشتەکان دەستیان لێیان بەرز دەکەنەوەو لێیان دەدەن، پێیان دەڵێن زوو گیانتان دەرکەنە دەرەوە، ئەمڕۆ ئازارو ئەشکەنجەی خەجاڵەتی دەدرێن، چونکە بەناهەق قسەتان بۆ خودا هەڵدەبەستا و خۆتان لەئاست ئایەتەکان و بەڵگەو نیشانەکانی بوونی خودا بەگەورە دەزانی.

**فریشتەکان و گیان دەرکردنی ئادەمیزاد:**

لەسەرەمەرگدا فریشتەکان دێنەلای ئادەمیزاد بۆ ئەوەی گیانی دەربکەن و لە جەستەکەی جیای بکەنەوە،سەرەڕای ئایەتە پیرۆزەکانی ڕابردوو کەئەم ڕاستیەیان

سەلماند، یەکێك لەفەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێت) دەخەینە پێش چاو، بێگومان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) لە خۆیەوە نادوێت، بەڵکو فەرموودەکانی ئەو لەلایەن خودای مەزن و کاریەجێوە بە سروش پێی ڕادەگەیەندرێت هەروەکو خودای مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾

واتە: بەپێی حەزو ئارزووەکانی نادوێت و قسەناکات، بەڵکو ئەوەی دەیدرکێنێت تەنیا فەرمان و سروشە پێی ڕادەگەیەندرێت.

ئیمای ئەحمەد(ڕەحمەتی خودای لێبێت) لەسەر زاری یاوەری ڕێزدار ئەلبەڕاء کوڕی عازب (خودا لێی ڕازیبێت) ئەم فەرموودەیە پیرۆزەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

خرجنا مع رسول الله [صلى الله عليه وسلم] في جنازة أحد من الأنصار فانتهينا إلى القبر ولما يلحد، فجعل رسول الله [صلى الله عليه وسلم] يرفع رأسه إلى السماء وينظر إلى الأرض و يحدث نفسه، قال ثم يقول استعيذوا بالله من عذاب القبر مراراً، ثم قال:

إن الرجل المسلم إذا كان في قبل من الآخرة و إنقطاع من الدنيا تراءت له ملائكة من السماء كأن وجوههم الشمس فتجلس له مد البصر، معهم أكفان من أكفان الجنة وحنوط من الجنة وتجيء ملك الموت فيجلس عند رأسه فيقول أخرجي أيتها النفس المطمئنة إلى مغفرة من الله و رضوان، قال فيخرج فيسيل كما تسيل القطرة من السقاء، فإذا أخذها قاموا إليه فلم يتركوها في يده طرفة عين،

قال ويخرج منه مثل أطيب ريح مسك يوجد على وجه الأرض يتصعدون به فلا يمرون على أحد من الملائكة إلا قال ما هذا الروح الطيب، قال فيقولون هذا فلان فتفتح أبواب السماء ويشيعه من كل سماء مقربوها حتى إذا إنتهى إلى السماء السابعة قيل اكتبوا كتابه في العليين، قال فيكتب، قال ثم يقال ارجعوه إلى الأرض فإن منها خلقناهم وفيها نعيدهم ومنها نخرجهم تارة أخرى فيجعل في جسده فيأتيه الملائكة فيقولون له إجلس، من ربك فيقول ربي الله، قال يقولون ما دينك، قال يقول ديني الإسلام، فيقولون ما هذا الرجل الذي بعث فيكم، يقول هو رسول الله[صلى الله عليه وسلم]، فيقولون ما يدريك، فيقول قرأت كتاب الله فآمنت وصدقت، فينادون من السماء أن قد صدق فافرشوه من السماء وألبسوه من الجنة وأروه منزله من الجنة، قال فيصيب من روحها ويوسع له في قبره مد بصره ويمثل له رجل حسن الثياب طيب الريح، فيقول أبشر بالذي يسرك هذا يومك الذي كنت توعد، فيقول هو من أنت رحمك الله فوجهك الذي جاء بالخير، قال فيقول أنا عملك الصالح.. قال وإن كان كافراً نزلت عليه ملائكة من السماء سود الوجوه معهم مسوح، فيجلسون منه مد البصر، قال ويجيء ملك الموت فيجلس عند رأسه، فيقول أخرجي أيتها النفس الخبيثة إلى غضب من الله وسخطه، قال فيفرق في جسده كراهية له فيستخرجها تتقطع معها العروق والعصب كما يستخرج الصوف المبلول بالسفود، فإذا أخذها قاموا إليه فلم

يتركوها في يده طرفة عين فيأخذوها في أكفانها في المسوح، قال ويخرج منه مثل أنتن ريح وجدت على وجه الأرض، ويصعدونها لها فلا يمر على أحد من الملائكة إلا قال ما هذا الروح الخبيث، قال يقال هذا فلان بشر أسمائه، فإذا ارتفع إلى السماء استفتحوا فغلقت دونه الأبواب ونودوا ارجعوه إلى الأرض فإني منها خلقتهم وفيها أعيدهم ومنها أخرجهم تارة أخرى، فيجعل في جسده فتاتيه الملائكة فيقولون اجلس من ربك قال يقول ها، ها، لا أدري فيقولون ما دينك فيقول ها، ها، لا أدري سمعت الناس يقولون لا أدري، قال فيقولون من هذا الرجل الذي بعث فيكم، قال فيقول لا أدري سمعت الناس يقولون، قال فينادون من السماء أن كذب، أفرشوه من النار، وألبسوه من النار، وأروه منزله من النار، قال فيرى منزله من النار فيصيبه من حرها وسمومها، ويضيق عليه قبره حتى تختلف أضلاعه، ويمثل له رجل قبيح الوجه قبيح الثياب منتن الرائحة، فيقول أبشر بما يسوءك هذا يومك الذي كنت توعد، من أنت ويلك فوالله وجهك الذي جاءنا بالشر، فيقول أنا عملك الخبيث، فهو يقول يارب لا تقم الساعة يارب لا تقم الساعة.

**واته: لەگەڵ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) تەرمی یەكێك لە لایەنگران و یارمەتیدەرانمان برد بۆ گۆڕستان تا گەیشتین، گۆڕەكە تەواو نەبوبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) سەری بەرز دەكردەوە بۆ ئاسمان پاشان سەیری**

زەوی دەکردو لەبەر خۆیەوە قسەیەکی دەکرد، بەڕاء دەڵێ: دوای ئەمە چەند جار فەرمووی پەنا بۆخودا بەرن لە ئازاری گۆڕ، پاش ئەمە فەرمووی:
کاتێ موسڵمانێك بەرەو کۆتایی دەچێت و دەستی لە جیهان دەبڕێت، فریشتە لە ئاسماندا دەبینێت، ڕوخساریان وەك خۆرە تاچاو ببیینێت بەدەوریدا دادەنیشن، بالاپۆشیان(کفنیان) پێیە لە بالاپۆشی بەهەشتە، بۆنوبەرامی بەهەشتیان لایە، وە فریشتەی مردن واتە (عزرائیل) دێت لەلای سەری دادەنیشێت، دەڵێ ئەی گیانی ئۆقرەگرتو سرەوتو دەرچە دەرەوە بۆ لێخۆشبوون و ڕەزامەندی خودا، فەرمووی گیانەکە دێتە دەرەوە هەروەك دڵۆپێك لەدەمی ئاوخۆرەوەدا، کاتێ فریشتەی مردن گیانەکە وەردەگرێت فریشتەکان دەچنەلای تەنیا بۆ چاوتروکانێك لای ئەو نایهێڵنەوە، فەرمووی گیانەکە بۆنێکی هەیە وەك بۆنی خۆشترین بۆنی مسکی سەر زەویە، بەرزی دەکەنەوە بەلای هەر فریشتەیەك تێپەڕدەبن، دەڵێ ئەم گیانە کێیە، فەرمووی دەڵێن ئەمە فلانەکەسە،دەرگای ئاسمانی بۆدەکرێتەوە لە هەر ئاسمانێك نزیکەکانی بەرێیدەخەن تەنانەت دەگات بەئاسمانی حەوتەم،دەڵێن: نووسراوەکەی لە نووسراوە بالاکان بنووسن، فەرمووی دەنووسرێت، فەرمووی دوایی دەڵێن: بیگەڕێننەوە بۆ زەوی، چونکە بەڕاستی لەوێ دروستمان کردون و بۆ ئەوێ دەیانگەڕێنینەوە وە جارێکی دیکە لەوێ دەریاندەهێنینەوە، بۆیە دەیبەنەوەلای جەستەکەی، فریشتە دێن بۆلای پێیدەڵێن دانیشە: پەروەردگارت کێیە؟ دەڵێ خودا پەروەردگارمە، فەرمووی: پێیدەڵێن ئایینت چیە؟ فەرمووی: دەڵێ ئاییینم ئیسلامە، پێیدەڵێن: ئەو پیاوە کێیە نێردرابووە لای ئێوە؟ دەڵێ ئەوە پێغەمبەری خودایە(درودی خودای لەسەربێت)، پێیدەڵێن چۆن دەزانی؟ دەڵێ کتێبی خودام خوێندۆتەوە باوەڕمهێناوەو بەڕاستم زانیوە،لەئاسمانەوە بانگ دەکرێن کەوا ڕاست دەکات لەئاسمانەوە ڕایەخی بۆ ڕابخەن و لەبەهەشتەوە پۆشاکی بکەن و هەوارگەو شوێنی لەبەهەشت پیشانبدەن،فەرمووی: گیانەکەی پێیدەگات و تا چاو دەیبینێت

گۆڕەکەی بۆ فراوان دەبێت، وە یەکێك لەشێوەی پیاوێکی جوانپۆش بۆنخۆش پێیدەڵێ مۆژدە بەوەی کە دڵخۆشی و ئەوە ئەمڕۆژەیە کە بەڵێنت پێدرابوو، دەڵێ تۆ کێیت خودا لێت خۆشبێت و بەزەیی پێت بێتەوە ڕوخساری تۆ چاکە بەخشە، فەرمووی: دەڵێ من کردەوە چاکەکانی تۆم.. فەرمووی: وەئەگەر گاوربێت فریشتە لە ئاسمانەوە بۆی دادەبەزن ڕوخساریان ڕەشە پەڕۆیەکی زبریان لایە تا چاو بیبینێت بە چواردەوریدا کۆدەبنەوەو دادەنیشن، وە فریشتەی مردن دێت لەلای سەریەوە دادەنیشێت، دەڵێ دەرچە دەرەوە بۆ ڕقوقینی خودا ئەی گیان و خودی پیس، فەرمووی: بەڕقەوە لەجەستەکەی جیادەبێتەوە، وەفەرمووی: دەریدەکاتە دەرەوە ڕەگ و دەمارەکانی لەگەڵ دەپچڕێن هەروەکو خوری تەڕ بە ئاسنێکی گەرمکراو دەریکرێتە دەرەوە ئاوەهایە، جاکاتێ گیانەکە دەردەکاتە دەرەوە فریشتەکان هەڵدەستن نایەلن بۆماوەی چاوتروکانێك لای ئەو بمێنێتەوە، بەڵکو دەیخەنە ناو بالاپۆشەکەی پەڕۆ زبرەکە، فەرمووی: بۆنێکی بۆگەنی ئەوتۆی لێدێت لەهەموو بۆنە بۆگەنەکانی سەر ڕووی زەوی ناخۆشترە، وەبەرزی دەکەنەوە بەلای هەر فریشتەیەك تێپەڕدەبێت دەڵێ ئەو گیانە پیسە چیە؟ فەرمووی دەڵێن ئەوە فلان کەسە بەناخۆشترین ناو ناوی دەبەن، جاکاتێ بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان داوای دەرگا کردنەوە دەکەن، دەرگاکانی لەسەر دادەخەن و بانگەوازێکیان بۆدێت کە بیگەڕێننەوە بۆ زەوی، چونکە من لەوەوە هێناومەتەدی وە بۆ ناو ئەویش دەیانگەڕێنمەوە وە لەوەوە جارێکی دیکە دەریاندەهێنمەوە، بۆیە دەیبەنەوە لای جەستەکەی،جا فریشتە دێنەلای پێیدەڵێن دانیشە، پێیدەڵێن:پەروەردگارت کێیە؟ فەرمووی: دەڵێ ها..ها..نازانم، پێیدەڵێن: ئایینت چیە؟ دەڵێ ها..ها نازانم بیستوومە خەڵك دەڵێن...نازانم، فەرمووی: پێیدەڵێن ئەم پیاوە کێیە ناردرابوو بۆلاتان،فەرمووی: دەڵێ نازانم بیستوومە خەڵك دەڵێن...، فەرمووی: لە ئاسمانەوە بانگەوازیان بۆ دێت کە درۆیکرد، ڕایەخی لە ئاگر بۆ ڕاخەن، وە پۆشاکی لەئاگر

بەبەردابکەن، وەشوێن و هەوارگەی لە ئاگر واتە لە(دۆزەخ) پیشانبدەن، فەرمووی: هەوارگەی خۆی لە ئاگردا دەبینێت، گەرمیەکەو بڵێسەکەی پێدەگات وە گۆڕەکەی بۆ تەنگدەبێتەوە، پەراسووەکانی لەیەکتری تێپەڕدەبن، وە یەکێك لە شێوەی پیاوێکی ناشیرین و چڵکن و بۆگەن پێیدەڵێ موژدە لەم ئازارەی تێیکەوتوویت ئەوە ئەمڕۆژەیە کە بەڵێنت پێدرابوو، تۆ کێیت ئەی هاوار لەتۆ بەخودا ئەم ڕوخسارەت ناخۆشی بۆهێنام،پێیدەڵێت من کردەوە ناشیرینەکانی تۆم، بۆیە دەڵێ ئەی پەروەردگار با کاتی زیندووبوونەوە نەیەت، ئەی پەروەردگار با کاتی زیندووبوونەوە نەیەت.

ئەمە دەقی فەرموودەکەی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێت) هەروەك لە کتێبی(الأحادیث الطوال ـ فەرموودە درێژەکان)ی دانەری زاناو ڕێزدار(ئەبولقاسم سولەیمان کوڕی ئەحمەد ئەلتەبەرانی)دا هاتووە.

بەڵام لە هەندێ سەرچاوەی تردا هاتووە کە پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) لەم فەرموودەیەی ڕابردووی کاتێ سەبارەت بە گیانی گاوران فەرمووی: گیانی گاوران بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان و دوایی دەرگای ئاسمانیان لێناکرێتەوە، ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:

﴿ لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾

واتە: دەرگاکانی ئاسمانیان لێناکرێتەوە و ناچنە بەهەشت تەنانەت ووشتر نەچێت بەکونی دەرزیدا.

هەروەها پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرموویەتی دوای ئەوە گیانەکەی بە فڕێدان فڕێدەدەن بۆ سەرزەوی، دوایی فەرمووی خودای مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ (٣١) ﴾

**واته: وه ئەوەی هاوبەش بۆ خودا دادەنێت وەك ئەمە وایە كە لە ئاسمان بكەوێتە خوارەوە باڵندە پەلاماری بدەن پارچە پارچەی بكەن و بیخۆن یان بایێكی بەهێز بیفرێنێت و بیبات بۆ شوێنێكی دوورو بەربڵاو.**

**هەروەها ئیمام موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێبێت) لەسەر زاری هەمان یاوەری پێشوو واتە(ئەلبەڕاء كوڕی عازب ـ خودا لێیخۆشبێت) دەڵێ پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) فەرموویەتی:**

إن المسلم إذا سئل في القبر يشهد أن لا إله إلا الله محمد رسول الله فذلك قوله تعالى( يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ) .

**واتە: موسڵمان كاتێ پرسیاری لێدەكرێت لەناوگۆڕدا گەواهی دەدات كە هیچ خودایێك نیە تەنیا (خودا ـ الله) نەبێت موحەممەد نێردراوی خودایە، ئا ئەمەیە كەخودا دەفەرمووێت ـ خودا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە قسەو گوفتاریان نەگۆڕو چەسپاو و ڕێكوپێك دەكات لە ژیاندا، وە بەباوەڕەوە دەمرن لەسەرەمەرگ و دوارۆژدا قسەو گوفتاریان نەگۆڕو چەسپاوو ڕێكوپێك دەكات، وەستەمكاران گومڕاو سەرلێشێواو دەكات وەئەوەی خودا بیەوێت دەیكات.**

**پەیوەندی نێوان گیان و جەستە:**

**دوای ئەوەی گیان لەجەستەدا دەردەچێت، ئیتر سەربەست و ئازاد دەبێت، دەیگەڕێننەوە بۆ ئەو شوێنەی كە پێش بوونی ئێمە تێیدابووە، بەڵام بەپێی فەرموودە پیرۆزەكەی ڕابردووی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ئەوا گیانەكە**

دووباره دەگەڕێتەوە بۆلای جەستەی مردووەکە پرسیارو وەڵامی لەگەڵدا دەکرێت، ئیتر ئەگەر جەستەکەی لە ژیاندا کاری چاکەی ئەنجامدابێت و باوەڕی تۆکمەو تەواوی هەبووبێت، ئەوا گیانەکەی لە دوای مردن ئاسوودەو بەختەوەر دەبێت، بەڵام ئەگەر کارو ڕەفتاری نارێکی ئەنجامدابێت، باوەڕدار نەبووبێت ئەوا گیانەکە لە ئازارو ئەشکەنجەدا دەبێت، پەروەردگاری مەزن کاتێ گیانەکانی دروستکرد هەمووی لە شوێنێکی تایبەتدا هەڵواسی، ئیتر هەر گیانێك لەم شوێنە تایبەتەدا دەمێنێتەوە تائەوکاتەی جەستەکەی تایبەت بەئەو واتە بەگیانەکە،لەسکی دایکیدا تەمەنی دەگاتە سەدوبیست ڕۆژ واتە چوار مانگ، ئەوکاتە بەفەرمانی پەروەردگاری کاریەجێ ڕاستەوخۆ گیانەکە دێتە ناو جەستەی کۆرپەڵەکە، ئینجا دوای ئەوەی کۆرپەڵەکە لەدایك دەبێت ئیدی جەستەکە پێشەوایەو گیانەکە دەبێتە پاشکۆی ئەو، بۆیە خۆشی و ناخۆشی، تاڵی و شیرینی گیانەکە بەندە بە خۆشی و ناخۆشی و تاڵی و شیرینی جەستەکە، واتە بەندە بەو ڕەفتارانەی لە ژیاندا ئەنجامیان دەدات، کەواتە گیانەکە دەسەڵاتی بەسەر جەستەکەدا نیە.

بەڵام دوای مردن ئەم شێوازە دەگۆڕێت و پێچەوانە دەبێتەوە، واتە جەستەکە بەدوای گیانەکە وێڵ و سەرگەردانە، ئیتر ئەو دەبێتە پاشکۆی گیانەکە، یان بە واتایەکی دیکە: جەستەی مرۆڤ لەژیاندا دیارەو ئاشکرایە، بەڵام گیانەکەی لەناو جەستەکەیدا بەندە شاراوەو بزرە، کەواتە جەستە گۆر ئاسایە واتە وەك گۆڕە بۆ گیانەکە، کەچی قۆناغی دوای مردن پێچەوانە دەبێتەوە، لە جیهانی گیانەکاندا گیانی مرۆڤ ئاشکراو دیارە، بەڵام جەستەکان لەناو گۆڕدا شاراوەو بزرن.

سەرەڕای ئەمە هەندێ لە زانایان دەڵێن لە کاتی پرسیارو وەڵامی ناو گۆڕ گیانەکە دەچێتەوە بەر جەستەکە، بەڵام تێیدا ئۆقرەناگرێت و ناسرەوێت واتە(مستقر) نابێت، بەڵکو بۆ ماوەیەکی دیار کراو بەجەستەکەوە هەڵواسراو دەبێت بۆ نموونە:

دەتوانین بڵێین وەکو پیاوە کوژراوەکەی (بەنی ئیسرائیل) چۆن کاتێ گۆشتی مانگا زەردەکەیان خستەسەر تەرمەکەی بۆماوەیەکی کەم گیانی هاتەوە بەر جەستەکەی و زیندووبووەوە، بەڵام تەنیا ناوی بکوژەکەی خۆی درکاندو دوایی مردەوە،(ئەوەی دەیەوێ سەرو سەربردەی ئەم نموونەیە بزانێت دەتوانێت لە سورەتی ئەلبەقەرە لە قورئانی پیرۆزدا بە درێژی بیخوێنێتەوە). یان وەکو (یارانی ئەشکەوت ـ چۆن دوای سێسەدو نۆ ساڵ زیندووبوونەوە دوایی یەکسەر مردنەوە تەنانەت بۆیان نەبوو خواردن و خواردنەوەش بخۆن و بخۆنەوە، چونکە تەنیا بۆ مەبەستی دەرخستنی مەزنی و سەلماندنی توانای لەبن نەهاتووی پەروەردگار بۆ ئەم ماوەیە کەمە زیندووبوونەوە).

ئیتر پرسیارو وەڵام لە نێوان دوو فریشتەکەو مردووەکە بەم شێوەیەو بەمجۆرە دەبێت، سەبارەت بە گەڕانەوەی گیان بۆ ناو جەستەکە.

دوای ئەمە جەستەکە لەم گەردوونە فراوانەدا دەمێنێتەوە هەمیشەو بەبەردەوامی پەیوەندی لەگەڵ جەستەکەدا دەمێنێت بۆ نموونە:

چۆن ئەگەر هەور کەلێنێکی تیادا بکەوێت دەبینین تیشکی خۆر پەڕەکانی یان باڵەکانی لە میانەی ئەم کەلێنەدا شۆڕ دەکاتەوە خوارەوە بۆ سەر زەوی، گیانیش بەم شێوەیە هەمیشە تیشکی دیدو بینینی بەرەو جەستەکەیەتی، جا لەهەر شوێنێك بێت لەم گەردوونە فراوانەدا.

یان ئەگەر سەیری ئاوێنەیەك بکەین دەبینین تیشکی خۆر و هەموو تیشکێکی تر پێچەوانە دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر بێتو ئاوێنەکە بشکێنین و بیکەینە چەندین پارچە، ئەو کاتە هەر پارچەیەك چەقێکی بۆ دێتەکایەوەو تیشکەکان پێچەوانە دەکەنەوە، ئیتر لاشەی ئادەمیزادیش ئاوێنە ئاسا، هەر پارچەیەك پەیوەندی تایبەتی خۆی لەگەڵ گیانەکەیدا بۆ دێتە کایەوە بێ ئەوەی کار لەوەی دیکەیان بکات.

**لێرە دەڵێین ئایا گیان چیە؟:**

تا ئێستا زانستەکانی فیزیا ـ کیمیا ـ زیندەوەرزانی ......هتد، یان چاکتر وایە بڵێین سەرجەم ئەو زانستانەی پەیوەندیان بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە، نەیانتوانیوە یەك تۆزقاڵ لە گیان واتە لە (ڕوح) تێبگەن، بگرە تەنانەت زانیارییێکی سەرەتاییان سەبارەت بە گیانەوە بەدەست نەهێناوە، کەواتە هیچ کەسێك یان دەزگاییێکی زانستی ئەکادیمی یان پیشەیی زۆر پێشکەوتوو ناتوانێت و نازانێت پێناسەی گیان بکات، هەروەها بۆیان نیە لێکۆڵینەوەو توێژینەوە دەربارەی گیان بکەن.

بێگومان گیان بەچاو نابینرێت،بەڵام وێڕای ئەوەش هەموو مرۆڤێك جا باوەڕداربێت یان بێ باوەڕبێت باوەڕی بە بوونی گیان هەیە، هەموو کەسێکی هۆشدار دەزانێت سەرجەم جوولەو میکانیزمی زیندەوەران لەمەڕ گیانە، بێگومان ئەمە ڕاستییێکی بەڵگە نەویستە، چۆن هەرکاتێك گیان لە جەستە جیابوەوە ئەوا جەستەیەکی سارد و سڕو بێ جوولەو مردو دەکەوێتە خوارەوە، تەنانەت کەس بۆینیەو ناتوانێت پەیکەرەکەی بەشێوەی دانیشتن یان بەپێوە ڕابگرێت، چونکە دەکەوێتە خوارەوە، سەرەڕای ئەمەش دوای چەند کاتێکی کەم (بەپێی چۆنیەتی و باری کەشوهەوا) هەست دەکرێت لاشەکە بۆگەن دەبێت.

ئەگەر بێتو لەکاتی سەرەمەرگدا واتە پێش ئەوەی گیانەکە دەربچێت و جیابێتەوە جەستەکە بخەینە ناوژوورێکی پۆلابەندو قورقوشم یان شووشەوە دەبینین گیانەکە هەر جیادەبێتەوە، کەواتە دەتوانین ئەوەندە بڵێین هەروەك دیارەو ئاشکرایە گیان بەچاو نابینرێت، فریشتە ئاسا باکی بەهیچ بەربەستێك و کۆت و بەندێك نیە، هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك ڕێگای پێناگرێت، بەناو هەموو ماددەیەکدا تێپەڕدەبێت.

وەك دیارەو ئاشکرایە خودای زاناو باڵاو مەزن نەیویستووە ئادەمیزاد زانست و زانیاری دەربارەی گیان هەبێت، تەنانەت دەرفەتی توێژینەوەی سەبارەت بە گیان پێنەداوە تا زانایان لەم بوارەدا ئەسپی خۆیان تاوبدەن و لێکۆڵینەوەی بۆ بکەن،

هەوەك لەلاپەڕەكانی ڕابردوو ئاماژەمان بۆی كردوە، بەلام دووبارە دەڵێین هەروەكو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيـلًا ﴾

واتە: ئەی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێت) پرسیارت لێدەكەن دەربارەی گیان(ڕوح) بڵێ گیان فەرمانێكە و كارێكە لە فەرمانەكان و كارەكانی پەروەردگاری من، وە ئێوە هەرچەند زاناو بەهرەمەندبن ئەوا تەنیا زانستێكی كەمتان پێدراوە.

ئەگەر بە ووردی سەرنجبدەینە ئەم ئایەتە پیرۆزە، دەبینین هەرچەندە گیان لەناو جەستەی ئێمەی ئادەمیزاد دایە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگاری مەزن ویستی وابوە هیچ زانیارییێك دەربارەی گیان بۆ ئادەمیزاد ئاشكرا نەكات نە بەهێما و نە بەڕاستەوخۆ، هەروەك لەلاپەڕەكانی ڕابردوو ئاماژەمان بۆی كردو گوتمان مرۆڤ پێكهاتووە لە(گیان+ جەستە)، سەیركە زانستەكانی پەیوەستە بە جەستەمانەوە چ پێشكەوتنێكی مەزنی بە خۆیەوە بینیوە لە هەموو بوارێكەوە، بەلام سەبارەت بە گیان تەنانەت یەك هەنگاوی بچووكیش نەنراوە، بگرە هیچ زانایێك نەیتوانیوە بۆچوون و ڕای خۆی لەم بوارەدا دەرببڕێت، چۆن پەروەردگاری كاربەجێ ویستوویەتی بەئادەمیزاد ڕابگەیەنێت هەرچی زانست و زانیاری هەیە ئەگەر پەروەردگاری مەزن خۆی بۆ ئێمەی ڕوون نەكردبێتەوە، جا ئەم ڕوونكردنەوەیە چ بە هێمابێت یان بە ئاماژە بۆكردن و بەدرێژی باسی كردبێت و بابەتەكەی بەتەواوی شی كردبێتەوە، ئەوا ئێمە بۆمان نیەو ناتوانین دەربارەی ئەم زانستەو بابەتە هەوڵەكانمان بخەینە گەڕ، تەنانەت ئەگەر هەوڵ و كۆششمان بخەینە گەڕیش ئەوا دەرەنجام سەركەوتو نابین و هیچ ئەنجامێك بەدەست ناهێنین.

بەلام ئەوەی مرۆڤ هەستی پێدەكات دەربارەی گیان ئەوەیە كە :

گیان تەنێکی شەفافی زیندووە، بزرو نادیارە هەرگیز بە چاو نابینرێت، لەناو شانەو بنچینەو پێکهاتەی تەنە چرەکاندایە، لەگەڵ تەنەچرەکاندا بەجۆرێك لەیەکتر ئاڵاوون وەك دارو درەخت و ئاو ئاسا چۆن ئاو لەناو سەوزەگیاو دارو درەختدا بوونی هەیەو بوونیان بەندە بە ئاوەکەوە، دەتوانین بڵێین گیان و جەستەش بەهەمان شێوەیە.

ئیتر لەمە پتر بۆمان نیە بچینە ناو بابەتی گیان(ڕوح)، ئەوەك خۆمان بخەینە بەر حوکمی ئایەتی قورئانی پیرۆز، چۆن خودای بەرزو باڵادەست سەبارەت بەم بابەتانەی زانیاری تەواومان دەربارەیان نیە فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا  ﴾

واتە: زانستت دەربارەی شتێك نەبوو تیرو توانجی بۆ مەهاوێژەو لەسەری مەدوێ، چونکە بەڕاستی بیستن و بینین و دڵ و دەروون ئەمانە هەموویان بەرپرسیارن لە بەرامبەریدا.

سەرەڕای هەموو ئەوەی ڕابردوو گیانی ئادەمیزاد سەرەتای دروستبوونی هەیە، بەڵام کۆتایی نیە، چونکە دوای مردن گیانەکە هەمیشەییەو دەمێنێت، لەبەر ئەوەی وەکو لە لاپەڕەکانی ڕابردوو ئاماژەمان پێکرد،مردن بریتیە لە گواستنەوەی ئادەمیزاد لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە، ئیدی ئەوەی گۆڕانی بەسەر دادێت لەدوای مردن تەنیا جەستەکەیە، بەڵام گیانەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە، بۆیە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کە یەکێبووە لە فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی ئەمەوی، پیاوێکی زۆر ئایینپەروەرو لەخوداترسبووە( ڕەحمەتی خودای لێبێت) سەبارەت بەمردن دەیگوت:

(إنما خلقتم للأبد ولكنكم تنتقلون من دارٍ إلى دار) .

واتە: ئێوە بۆ هەتا هەتایە هاتوونەتەدی و دروستکراون بەڵام لە خانوێکەوە دەگوازرێنەوە بۆ خانوێکی دیکە.

دووەم: گۆڕ:

بێگومان دوای مردن مرۆڤ جەستەکەی ژێرخاك دەکرێت و دەخرێتە ناو گۆڕەوە، بەڵام ئەگەر سەرنجبدەین و ئاوڕێك لە سەرەتای دروستبوونی ئادەمیزاد بدەینەوە، دەبینین مرۆڤ لەخۆیەوە ئەم زانیاریەو شارەزاییەی نەبوە تا مردوو ژێرخاك بخات، بەڵکو وەك لەلاپەڕەکانی ڕابردوو گوتمان هەموو زانیارییێك لەلایەن پەروەردگارەوە ڕێنمایی بۆکراوە، بێگومان ژێرخاك کردنی مردووش یەکێکە لەم زانیاریانەی لەلایەن خودای کاربەجێوە ئاراستەی ئادەمیزاد کراوە، بۆ ڕاستی و دروستی ئەمە بزانە خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا سەبارەت بەدوو کوڕەکەی ئادەم (سڵاوی خودای لێبێت) چی فەرمووە:

کاتێ هابیل قابیلی برای دەکوژێت، ئیتر دوای کوشتنی نازانێت تەرمەکەی چی لێبکات، لەوکاتە پەروەردگاری مەزن بە مەبەستی ڕێنمایی کردن قەلەڕەشێك دەنێرێت لە نزیك ئەوەوە تەرمی قەلەڕەشێکی تری مردوو بەدەنووك و قاچەکانی ژێرخاك دەخات، ئیتر کوڕەکەی ئادەم لە قەلەڕەشەکەوە فێری ناشتنی تەرمەکەبوو، ئیتر لەم کاتەوە بۆ سەرجەم نەوەکانی ئادەم بوو بە ئەرك دەبێ تەرمی مردووەکان ژێرخاك بخەن، دەقی ئایەتە پیرۆزەکە:

﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ ۚ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى ۖ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾

واتە: خودا قەلەڕەشێکی نارد زەوی هەڵکۆڵی تا پێشانی بدات چۆن تەرمی براکەی بشارێتەوە، گوتی هاوار بۆخۆم ئایا دەبێ وەك ئەم قەلەڕەشە براکەم ژێرخاك بخەم و بیشارمەوە، بۆیە بووە یەکێك لە پەشیمانان.

بەڵام ئێمە لێرە مەبەستمان ڕوونکردنەوەی مانای ئایەتە پیرۆزەکە نیە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە وەك دیارە لەم ئایەتە تا ئەم کاتەی ئەم کوڕەی ئادەم براکەی خۆی نەکوشتوە مردن نەبووەو ڕووی نەداوە، بۆیە نەیدەزانی تەرمی براکەی چی لێبکات، ئیتر تا ڕێنمایی لەلایەن خودای مەزنەوە بۆ ئادەمیزاد نەهات لەخۆیەوە زانیاری و شارەزایی نەبوەو بیری بۆ ئەوە نەچووە تەرمی مردوو ژێرخاك بخات و بیشێرتەوە.

## هۆکارەکانی شاردنەوەو گۆڕ هەڵکەندن:

بۆ شاردنەوەی تەرمی مردوو لەناو خاکداو خستنە ناو گۆڕ، چەند هۆکارێك هەیە لە هەموویان گرنگتر ئەمانەن:

١- پاراستنی ژینگەو ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.

٢- ڕێزگرتن لە ئادەمیزاد، چونکە ئەگەر تەرمەکەی ژێرخاك نەکرێت کەواتە دەبێتە خۆراکی دڕندەو داڵ، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر هەر جۆرە ڕێگایەکی تر بگرینەبەر جگە لە ژێرخاك کردن بۆ لەناو بردنی تەرمەکە، لە پلەو پایەو پیرۆزی ئادەمیزاد کەم دەکاتەوە، چونکە ئەگەر ڕێگاییێکی پیرۆزترو شیاوترو لەبارترو گونجاوتر بۆ ئادەمیزاد هەبوایە ئەوا بەدڵنیاییەوەو بێ هیچ دوودڵیەك دەڵێین ئەو کاتە خودای مەزن ئەو ڕێگای بۆ ئێمە دادەناو دەیکردە ئەرك.

٣- داپۆشینی جەستەی ئادەمیزاد، چونکە هەندێ شوێنی جەستەی پیاوان و سەرجەم جەستەی ژنان، نابێ بە مردووەتیش کەسێکی تر بە نا حەڵاڵی بیبینێت.

٤ـ وونبوونی دیمەنی مردوەکە لەپێشچاوی کەسوکارو خزم وئازیزان ودۆستان و خۆشەویستانی، وێڕای ئەمەش بەم کارە بەرەبەرە غەم و پەژارەیان کەم دەبێتەوە.

٥ـ دیاربوونی گڵکۆی مردووەکە بۆ کەسوکارو دۆستانی. ئەگەر بیانەوێت سەردانی گۆڕەکەی بکەن.

٦ـ ئەگەر گۆڕ نەبوایە، کەواتە گۆڕستانیش نەدەهاتەکایەوەو نەدەبوو، بێگومان گۆڕستانیش یەکێکە لە ڕێگاکانی ئامۆژگاری کردنی خەڵك بۆ ئەوەی زۆربایەخ بە ژیانی ئەم جیهانە مایە پووچە نەدەن، بەڵکو پەند لەم مردوانە وەربگرن.

ئێمەی ئادەمیزاد بەپێی ڕواڵەت و دیدوبۆچوون تەنیا ئەمەندە سەبارەت بە گۆڕ دەزانین، بەڵام لەبەرئەوەی جیهانی گیانەکان شاراوەو نادیارو بزرە واتە غەیبە، بۆیە ناچارین پەنابەرین بۆقورئانی پیرۆزو پێغەمبەری خۆشەویستمان (درودی خودای لەسەربێت) تابزانین دەربارەی گۆڕ چیان فەرمووە.

**گۆڕ هەوارگەیە:**

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) سەبارەت بەگۆڕ لە کتێبی(القول الحثیث بشرح لباب الحدیث ـ نوسینی زانای بەناوبانگ جلال الدین کوڕی کمال الدین السیوطي ـ کەلەساڵی ١٩٣٤ لە میسر چاپ کراوە) فەرموویەتی:

(القبر أول منزل من منازل الآخره و آخر منزل من منازل الدنیا) .

واتە: گۆڕ یەکەم هەوارگەیە لە هەوارگەکانی دواڕۆژ و دواترین هەوارگەیە لە هەوارگەکانی جیهان.

هەوارگە:بەم شوێنە دەگوترێت کە خەڵك بەیەکجاری تێیدا نیشتەجێ نابێت، بەڵکو مانەوەی لەم هەوارگەیە بۆماوەیەکی کاتیە، جا ئەم ماوە کاتیە کورت بێت یان

نەختێ درێژبێت، دوایی لەوێوە واتە لەهەوارگەکەوە بۆ هەوارگەیەکی تر یان بەرەو شوێنی مەبەستی سەرەکی دەچێت.

کەواتە کاتێ ئێمەی ئادەمیزاد دەگوازرێینەوەو دەچین بۆ جیهانی سرەوتووی گیانەکان، لەسەرەتادا لەهەوارگەی گۆڕ پێشوازیمان لێ دەکرێت، ئەمە سەرەتایەکە بۆ چوونە ناو جیهانی ناوبراو، رەنگە ئەم نموونەیەی داهاتو ئاسانکاریمان بۆ بکات دەربارەی هەوارگەی گۆڕ:

هەوارگەی گۆڕ وەك پرسگەی دامودەزگاکانە، چۆن کاتێ یەکێك دەچێتە لای کاربەدەستێك یان دەسەلاتدارێك، لەپێش هەموو شتێك دەبێ ئەم کەسە بە پرسگەی دەزگاکەدا تێپەرێت، ئیتر دوای چەندین پرسیارو وەلام ئینجا بواری چوونە ژوورەوەی پێدەدرێت، بەلای هەر ژوورێکدا تێپەرێت چەندین پرسیارو وەلامی لە هەموو بوارێك و ڕووێکەوە لەگەلدا دەکەن، جا ئەگەر بێتو هەلوێست و بۆچوونەکانی ئەو کەسە لەگەل هەلوێست و بۆچوونەکانی دەسەلاتدارەکە یەکبوو، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر خاوەن کردارو چالاکی بوو، ئەوا دەست و پێوەندەکانی سۆزو خۆشەویستی بۆ دەنوێنن، بەخێرهاتنێکی گەرمی دەکەن لە شوێنێکی خۆش و دلگیرو جوان دایدەنێن تا ئەو کاتەی دەرفەتی چوونە ژوورەوەی دەبێت ئەو کاتە بەرێزەوە دەیبەن بۆلای دەسەلاتدارەکە، بەلام ئەگەر لە پرسگەکە بۆیان دەرکەوت کەسەکە هەلوێستی پێچەوانەی فەرمانەکان و ویستی دەسەلاتدارەکەیە، سەرەڕای ئەمەش چەندین رەفتارو کردەوەی ناپەسەندی دژی ئەم دەسەلاتدارە ئەنجامداوەو هەمیشە دژی ئەو هەلسوکەوتی کردوە، بێگومان ئەو کاتە لە شوێنێکی نالەبارو نارێك دایدەنێن، کاتێ رێگای چوونە ژوورەوەی پێدەدرێت تا بچێتە لای دەسەلاتدارەکە ئەوا لەپرسگەوە تا دەگاتە شوێنی مەبەست زۆر بێ رێزو بەسووکایەتیەوە سەیری دەکەن و دەیبەنەلای، ئیتر بێگومان ئەم کەسە هەر زوو لەسەرەتای سەردانەکەیدا واتە لە پرسگەکەدا دەزانێت ئەنجامەکەی چۆنەو

چۆندەبێت، سەبارەت بەم بابەتە(ئەبوداوود ـ ڕەحمەتی خودای لێبێت)لەسەر زاری یاوەری ڕێزدار(ئەنەسی کوڕی مالیك ـ خودا لێی ڕازیبێت) فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەرمان(درودی خودای لەسەربێت) بۆ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

(إن العبد إذا وضع في قبره وتولى عنه أصحابه أتاه ملكان فيقعدانه فيقولان له من ربك وما دينك وما هذا الرجل الذي بعث فيكم فيقول المؤمن ربي الله وديني الأسلام والرجل المبعوث رسول الله (ﷺ) ويقول الكافر في الثلاث لا أدري).

واتە: کاتێ بەندە دەخرێتە ناو گۆڕەکەی و دۆست و هۆگرانی لێی دادەبڕێن و جێیانهێشت، دوو فریشتە دێنەلای دایدەنیشێنن پێیدەڵێن کێ پەروەردگارتە؟، وە ئایینت چیە؟، ئەی ئەو پیاوە کێیە کەناردراوبوو بۆ ناو ئێوە؟، جا ئەوەی باوەڕداربێت دەڵێ خودا پەروەردگارمەو ئایینم ئیسلامەو ئەو پیاوەی نێردراوە پێغەمبەری خودای(درودی خودای لەسەربێت)، وە گاور لە هەرسێ وەڵامەکەدا دەڵێ نازانم.

(بۆیە فریشتەکان دەڵێن ـ ئەو پیاوە ـ ناڵێن ئەو پێغەمبەرە یان ئەو پیاوە مەزنە یان ئەو خۆشەویستە، تاوەکو تاقیبکەنەوە بزانن ئایا وەڵامەکە دەزانێت یان نا، چونکە ئەگەر ناوەکەی بە گەورەو مەزنی بێنن ڕەنگە پرسیار لێکراوان گومان بکەن و ناوەکە بزانن، واتە لەمەبەستی فریشتەکان بگەن).

لێرە پرسیارێك دێتە ئاراوە:

**ئایا ئەو جەستانەی نەماوون چۆن پرسیارو وەڵامیان لەگەڵدا دەکرێت؟:**

لە وەڵامدا دەڵێین پرسیارو وەڵام لەگەڵ سەرجەم مردووەکان واتە ئەوانەی گیان لەدەست دەدەن دەکرێت نەك تەنیا لەگەڵ ئەو کەسانەی لەناو گۆڕدا نێژراون،

بەڵکو هەموو مردوویێك ئەم پرسیارانەی ڕابردووی ئاراستە دەکرێت، جا ئەگەر لاشەکەیان پارچەپارچەو تیکەتیکە بوو بێت، یان شێرو درندە خواردبوویان، یان سووتابێت و خۆڵەمێشەکەی با پەرتوو بڵاوی کردبێت، یان لەژێر ئاوی دەریادا خنکابێت، (ئەمە زانستێکە لە سەرووی ئاستی تێگەیشتن و هۆشی ئێمەدایە)، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین خودا دەسەڵاتی ئەوەندە زۆرەو توانای لەبن نەهاتوە، بۆیە ئەمە لە ئاست دەسەڵات و توانای خودای مەزن زۆر ئاسانە، زۆر بە ئاسانی گیانەکان دەخاتەوە بەر جەستە، گەرچی پارچەپارچەش بووبێت.. بۆ نموونە:

(ئەگەر ئامێرێکی تەلەفزیۆن بەرگەکەی لێبکەینەوەو ووردوخاش بکەین، دوایی شاشەکەی لەلایێکی ژوورەکە دابنێین، بڵند گۆکەی لەلاییێکی تر هەڵواسین، ئەنتیگرێت و ترانسستەرو تەبلەو نەخشەو کەرستەکانی دیکەی هەریەك لەلایەك، یان لەژوورێکی دیکە هەڵواسین و دابنێین، بەڵام وەکو جاران پەیوەندی و گەیاندنیان لەنێواندا بمێنێت لە میانەی تەل و وایەرەکانیانەوە، دەبینین تەلەفزیۆنەکە وەکو جاران کار دەکات و شاشەکەی وێنەکانی تێدا دەردەکەوێت، بێگومان گەڕانەوەی گیان بۆناو لاشەکان بەمجۆرە نیە، بەڵام دڵنیابە لای خودای پڕ لەتواناو داناو زانا زۆر لەمە ئاسانترە، چونکە پەیوەندیەکەی پێشووتریش خۆی دایهێنابوو ئیتر ئەوەی دووەمیان لەوەی پێشووتر ئاسانترە، وەکو نموونەی ئاوێنەکەی لە ڕابردوودا ئاماژەمان بۆی کرد هەر پارچەیەك لە جەستەی ئادەمیزادا پەیوەندی تایبەتی خۆی لەگەڵ جەستەکەدا بۆ دێتەکایەوە.

جگەلەمە خودای مەزن و باڵادەست توانای هەیە چاو، دەست، قاچ، پێ، گوێچکە، سەرجەم ئەندامانی لەش بێنێتە ئاخاوتن، هەوەکو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

واتە: تاوانباران بە پێستەکانی خۆیان دەڵێن بۆچی گەواهیتان لەسەر ئێمەدا، پێستەکانیان دەڵێن ئەم خودایە ئێمەی بەدەنگ هێنا کە هەموو شتێکی بەدەنگ هێناوە وەئەو یەکەمجار دروستی کردوون و بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە.

**دوای پرسیارو وەڵام گۆڕ بەهەشتە یان دۆزەخە:**

ئەگەر مردوەکە لە وەڵامدانەوە سەرکەوتوو بوو، گۆڕەکەی بۆ دەبێتە مێرگێك لە مێرگەکانی بەهەشت، بەڵام ئەگەر وەڵامەکانی ڕاست و دروست نەبوو، یان باوەڕی بەخودای پەروەردگارو پەیامی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێت) نەبوو، ئەوا گۆڕەکەی دەبێتە چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ، هەروەکو لەسەرزاری زانایان(طبرانی و ترمذي - ڕەحمەتی خودایان لێبێت) لە کتێبی (تنقيح القول الحثيث بشرح لباب الحديث - جلال الدين السيوطي)دا هاتوە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەربێت) فەرموویەتی:

(القبر روضة من رياض الجنة أو حفرة من حفر النار).

واتە: گۆڕ مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت یان چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ.

ڕەنگە یەکێك لێرە پرسیار بکات و بڵێ: ئێمە جارێکیان تەرمێکمان گواستەوە لە گۆڕێکەوە بۆ شوێنێکی تر، کەچی هیچمان نەبینی لەناو گۆڕەکەدا، نە گوڵ و گوڵزاری بەهەشت و نە ئاگرو ئازاری دۆزەخ؟!.

**بۆچی بەهەشت و دۆزەخ لەناو گۆڕدا دیارنیە؟:**

لەوەڵامدا دەڵێین زۆر ڕاستە، نابێ ئێمە هیچ بەدی بکەین، چونکە ئەگەر ئێمە لەناو هەر گۆڕێکدا بەهەشت یان دۆزەخ بەچاوی خۆمان ببینین، کەواتە بەهەشت بۆ شاراوەو نادیارە، چونکە ئەگەر بەچاو ببینرابوایەو دیاربوایە ئەو کاتە هەریەکێك لە

ئێمە دەیتوانی بەهەشت و دۆزەخ ببینێت، ئەویش لە ڕێگای ئالاو والا کردنەوەی گۆڕێك دوای ناشتنی تەرمێك تێیدا، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر ئێمە بەچاوی خۆمان ناتوانین بەهەشت و دۆزەخ ببینین، چونکە زووم و تۆڕی بینینی چاوی ئێمە لە ئاست بینینی شتە ماددیەکان و دیارەکانی ئەم جیهانەیە، توانای بینینی شتەکانی جیهانی سرەوتن و گیانەکانی نیە، هەروەك چۆن بیستنمان توانای بیستنی دەنگەکانی جیهانی سرەوتنی نیە، چونکە شەپۆلەکانی دەنگی ئەم جیهانە لە ئاست بیستنی ئێمەیە، بەلام شەپۆلە دەنگێکی تر کە نزمی و بەرزی لەگەڵ شەپۆلە دەنگەکانی ئەم جیهانە ماددیە جیاوازبێت و لە دەرەوەی بازنەی جیهانی ماددی ئێمە بێت هەرگیز ناتوانین و بۆمان نیە هەستی پێبکەین و ببیستین. وێڕای ئەمەش هۆکارەکەی بۆ باوەڕی تۆکمەو بەهێز دەگەڕێتەوە، چونکە ئەگەر بەچاو بەهەشت و دۆزەخمان ببینیایە ئەو کاتە باوەڕهێنان هیچ تاموچێژی نەدەما، لەبەرئەوەی لەبەر خۆشی بەهەشت و لەترسی دۆزەخ سەرجەم خەڵك باوەڕیان دەهێناو بۆچوون و بیرو ئایینی جیا جیا نەدەهاتە کایەوەو هەمووی یەك بیرو ڕاو مرۆڤی خودا پەرست و چاك دەبوون.

سەرەڕای ئەمەی ڕابردوو، هەریەك لە ئێمە نۆ مانگ لە سکی دایکماندا ژیاوین، ئایا کەس بۆی هەیە نکۆڵی لەم ڕاستیە بکات؟، بێگومان لە وەلامدا دەڵێین نەخێر، چونکە ئەمە ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە، جگە لەمە کێ لە ئێمە ئەم کاتەی لەیادە کە منداڵێکی ساوابوو، لە باوەشی دایکیدا پەروەردەکرا،بێگومان لەیادمان نەماوە، چونکە لەم قۆناغانەی ژیانماندا مێشکمان توانای تۆمارکردن و زەخیرەکردن و هەڵگرتنی زانیاری و ڕووداوەکانی نەبوو، ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مێشکمان پتر گەشەی کرد تەنانەت تەواو هەستمان بەهەموو شتێك کرد.

کەواتە دەتوانین بڵێین مێشکی مرۆڤ بەچەند بارێك یان قۆناغێکدا تێپەڕ دەبێت تا دەگاتە ئاستێکی تەواو ئینجا دەتوانێت مرۆڤەکە بەڕێوەببات، بەلام مێشکی مرۆڤ

هەرچەند ڕۆشن بێت و هەڵگری مەشخەڵی زانست بێت هەرگیز بۆی نیەو بەم ئاستە ئاگات بتوانێت بچێتە ناو جیهانی ئۆقرەو سرەوتن(ڕەوحانی) و گیانەکان، چونکە لەنێوان ئێمەو ئەو جیهانەی سرەوتنی گیانەکان پەردەیەك و بەربەستێك هەیە، ئەم پەردەیە تەنیا بەمردن دەتوانین بەناویدا تێپەڕین و بچینە دیوەکەی تری، بۆ نموونە:

کاتێ کۆرپەیەك لەسکی دایکیدابێت، بێگومان ئەو لەگەڵ ئێمەدا دەژیت و لەناو خێزانی یان کۆمەڵگەی ئێمەیە، بەڵام شاراوەو بزرو نادیارە تا ئەو ڕۆژەی لە دایك دەبێت، چونکە پەردەیەك لەنێوان ئێمەو کۆرپەکەدا هەیە بواری ئەوەنادات بە ئاشکرا ڕوخسارو شێوەی کۆرپەکە دیاربێت، بەڵام کاتێ سات و کاتی دیارکراوی لەدایکبوونی کۆرپەکە هات،کە تاکە ڕێگایە بۆپەڕینەوەی بۆ ئەم دیوەی پەردەکە، ئیتر سەرجەم شێوەو ڕوخسارو ڕەنگ و ڕووی بەدەردەکەوێت و دیاردەبێت.

هەروەها ئەگەر یەکێك لەلامان خەوتبێت، لەم خەوەیدا خەونێك ببینێت ئێمە هیچ هەست بەو خەونەی نووستوەکە ناکەین، کەچی ئەو لەناکاو بە ئاگادێت و خەونەکەی باس دەکات، ڕەنگە هەندێ جار لەخەودا تووشی دەردەسەری و نائارامی و کارەسات و بگرەوبەردە دەبین، کاتێ لەخەوەکە هەڵدەستین دەبینین تووشی دڵەکوتە بووینە، کەچی ئەو کەسانەی لە دەوروبەرمان دانیشتوون ئاگاداری هیچ نەبووینە، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ خەوتوەکە باسی خەونەکەمان بۆ دەکات زۆر بەدڵنیاییەوە پێی باوەڕدەکەین، چونکە خۆمان ئەمجۆرە بەسەرهاتانەمان بەناو مێشکدا تێپەڕیووە بۆیە باوەڕمان پێی هەیە.

ئیتر ئازارو ئەشکەنجەو خۆشی و ناخۆشی ناو گۆڕیش بەهەمان شێوەی خەونی نووستوەکەیە، چونکە جیهانی ئەودیو پەردە لەسەرووی ئاستی مێشك و دیدەو بیستن و هەستی ئێمەی ئادەمیزادە.

خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ١٠٠ ﴾

واتە: لەبەردەمیاندا پەردەیەك و بەربەستێك هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوودەبنەوە.

واتە ئەودیوەکەی تر هەردوولا دەستیان پێناگات، نە زیندوەکان دەتوانن ئەمدیو پەردەکە ببینن، نەمردوەکانیش بۆیان هەیە بگەڕێنەوە ئەودیوەی لای زیندوەکان.

**خەوتن لەمردن دەچێت:**

لەکاتی خەوتندا گیانی ئادەمیزاد چالاکیەکانی کەم دەبێتەوە بەتایبەتی لەبواری هەستکردن و جووله و بیرکردنەوە، بەلام لە بواری خودو میکانیزمی جەستەکەدا هەمیشە کاردەکات بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانە زیندەگیەکانی وەك هەناسەدان و هەرسکردن و پاشەڕۆ و هۆرمۆن و ئاوڕشتن لەگەڵ چەند جۆرە کارو فەرمانی تر، خەوتن یان نووستن بەندبوون و سستبوونی گیانە(ڕوحە) بەشێوەیەکی کاتی، بۆیە پەروەردگاری مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٤٢ ﴾

واتە:خودا گیانەکان دەگرێتەخۆی لەکاتی مردنیان و ئەوانەی نەمردوون خەوتوون واتە(لەکاتی خەوتنیان)ئەوەی مردوە گیانەکەی نانێرێتەوە بۆلای جەستەکەی، ئەوانەی تر دەنێرێتەوە واتە(گیانی خەوتوەکان)تا کاتی دیارکراویان، بەڕاستی ئەوە بەلگەیە بۆ ئەو کەسانەی بیر لەتواناو دەسەلاتی لەبن نەهاتووی خودا دەکەنەوە.

کەواتە خەو جۆرە مردنێکە، زانای بواری فیزیای ناووکی ئینگلیزی (ئارسەر ئەلیسۆن) لە کۆنگرەیەکدا لەشاری قاهیرەی پایتەختی میسر، سەبارەت بەمردن و

خەو بابەتێکی بەپێزی پێشکەش بە ئەندامانی کۆنگرەکە کرد، تێیدا هاتبوو کە خەو جۆرە مردنێکە، زانایێکی موسڵمان دوای کۆنگرەکە بە ئارسەر دەڵێ: ئایەتی ژمارە (٤٢) لە سورەتی (ئەلزومەر) ئاماژە بەم بابەتەی تۆ دەکات، ئارسەری زانا چاوەکانی مۆڵەق وەستاو سەری سوڕما، بۆماوەی چەند ڕۆژێك لەگەڵ زانا موسڵمانەکە خەریکی شی کردنەوەو مانای ئایەتە پیرۆزەکەبوون، دەرەنجام ئەم زانایە هۆشمەندە باوەڕی بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێنا.

**ئایا مردوو هەست بەکات(زەمەن) دەکات:**

مردووەکان هەست بەکات ناکەن، چونکە لەبارودۆخێك و لە جیهانێکی جیاواز لەم جیهانەی ئێمەدان، وەك لە چەند دێری ڕابردوودا ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کە مردن وەك خەوتن وایە، چۆن لە هەردوو دۆخەکەدا گیانەکان لەژێر سەرپەرشتی و فەرمانی پەروەردگاردان، ئەگەر هەریەکێك لەئێمە سەرنج بداتە خودی خۆی دەبینێت لەکاتی خەوتندا هەست بەکات ناکات، بۆ زانیاری زیاتر دەتوانیت ئەم نموونەیەی خوارەوە بەووردی پراکتیزە بکەیت ئینجا ڕاستی و دروستی ئەم بابەتەت بۆ ڕوون دەبێتەوە:

ئەگەر یەکێك لە ژوورێکی تاریك بخەوێت، ژوورەکە هیچ ئامێرێك و هۆکارێکی کات ژماردن و زانینی تێدا نەبێت، وێڕای ئەمەش تروسکایی ڕووناکی دەرەوەی لا دیار نەبێت، دوای ماوەیەك کە لەخەو هەستا هەرگیز نازانێت ماوەی خەوتنەکەی چەندبووە، ئایا یەك کاتژمێر بووە؟، یان یەك ڕۆژبووە؟، یان شەووڕۆژێك بووە؟، چونکە لە دۆخی خەودا کات(زەمەن) لە مێشکی ئادەمیزادا دەوەستێت لەبەر ئەوەی هوشیار نیە، بۆیە هەمووومان کاتێ لەخەو هەڵدەستین یەکسەر یان سەیری کاتژمێر دەکەین یان پرسیار لە دەوروبەرمان دەکەین بۆ زانینی کاتەکە.

کەواتە مردوو هەروەها خەوتووش لەدۆخێکی یان قۆناغێکی بێ کات دەژین،چونکە هەست بەڕووداوی گیانی(ڕوحی) دەکەن ئەمەش هیچ پەیوەندی بە جیهان و دۆخی فیزیایی و کاتەوە نیە.

سەرەڕای ئەمەش ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین مێشکی مرۆڤ چەندین بەسەرهات و ڕووداوی تێدا تۆمارکراوە بوەتە یادگار، بەڵام لەبەر ئەوەی یادەکان پەیوەندیان بەکاتەکانەوە نەماوە، بۆیە هەرکاتێك یادی یەکێك لەم ڕووداوانە دەکەینەوە هیچ پەیوەندی نیە بەو کاتەی کە ڕووداوەکەی تێدا هاتۆتەدی، چونکە لەکاتەکەی دابڕاوەو بووەتە یادەوەری، یادکردنەوە هیچ پەیوەندییەکی بەکاتەوە نیە، بۆیە سەرجەم یادەوەرییەکانی مرۆڤ هەرچەند کۆن بێت وساڵانێکی دوورودرێژی بەسەردا تێپەڕبووبێت کاتێ یادیان دەکەینەوە دەڵێین:(هەر دەڵێی دوێنێ بووە، ئێستاش لەبیرمە کە وامکردو وامکرد...هتد)، ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تۆمار نەکردنی کات لە مێشکی ئادەمیزادا، بەڵام لەناو گۆڕدا کات(زەمەن) بەهیچ شێوەیەك بوونی نیە، بۆیە لە دوارۆژدا کە زیندوو دەبینەوە پێمانوایە زۆر زوو زیندوو بووینەتەوە.

خودای زاناو باڵاو دانا سەبارەت بە نەبوون و وەستانی کات لەجیهانەکەی ئەودیوی پەردەوە لەچەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆ ئەمە کردوە، وەك ئەم سێ ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە:

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ۖ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾

واتە: وە ئەو ڕۆژەی کاتی زیندوبوونەوە دێت تاوانباران سوێند دەخۆن جگە لەیەك کاتژمێر نەماونەتەوە(جا چ لە ناو گۆڕدا یان لەژیانی جیهاندا) لە ژیانیشدا هەر ئاوا

شتی نابەجێیاندەگوت، وە ئەوانەی زانیاری و باوەڕیان هەیە دەڵێن ئێوە بەپێی بڕیاری خودا ئەو ماوەیەی بۆی دانابوون ماونەتەوە تا ڕۆژی زیندوبوونەوە ئەمڕۆ ڕۆژی زیندوبوونەوەیە بەڵام ئێوە باوەڕتان پێی نەبوو نەتاندەزانی.

یان ئەو پیاوەی پەروەردگاری مەزن بۆماوەی سەد ساڵ مراندی، دوای ئەوە زیندووی کردەوە، سەیرکە بزانە لەکاتی زیندوبوونەوەیدا چی گوتووە:

﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ﴾

واتە: خودا فەرمووی چەندت بەسەربردوە بە مردوێتی؟ گوتی: ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێکم بەسەربردوە !، خودا فەرمووی: بەڵکو سەد ساڵت بەسەربردوە.

هەروەها پەروەردگاری مەزن فەرموویەتی:

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ﴿٤٥﴾﴾

واتە: وە ئەو ڕۆژەی خودای مەزن هەموویان کۆدەکاتە پێیانوایە لەناو گۆڕدا تەنیا یەك کاتژمێریان لە ڕۆژێکدا بەسەربردوە هەموویان یەکتری دەناسنەوە.

**ئایا لەناو گۆڕدا ئازارو ئەشکەنجە هەیە؟:**

بێگومان بەپێی فەرمودەی پیرۆزی ڕابردووی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) باوەڕداران و چاکەکاران گۆڕەکانیان بۆ دەبێتە مێرگێك لە مێرگەکانی بەهەشت، هەروەها خراپەکاران و بێ باوەڕانیش گۆڕەکانیان بۆ دەبێتە چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ، واتە خراپەکاران و بێ باوەڕان لە دۆزەخدا دەژین، هەمیشە لە ئازارو ئەشکەنجەدان تا ڕۆژی دوایی و زیندوبوونەوە.

کەواتە دەبێ لەناو گۆڕیش، واتە لەجیهانی سرەوتووی گیانەکاندا ئازاردان هەبێت، ئەگەر بۆ ئەم مەبەستە سەرنج بدەینە قورئانی پیرۆز، دەبینین لە چەندین ئایەتی پیرۆزدا ئاماژە بۆ ئازاردانی ناو گۆڕ دەکات سەبارەت بەم کەسانەی باوەڕیان بە

خودای تاك وتەنیا و مەزن نەهێناوە، هەمیشە لە ژیاندا بەدوای جێبەجێکردنی حەزو ئارەزوەکانیان کەوتوون، ڕەفتارو کرداری نابەجێیان ئەنجامداوە، وەك:

﴿ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾

واتە: دارودەستەی فیرعەون تووشی سزاو ئازارێکی سەختبوون کە ئاگری دۆزەخە بەیانیان وئێواران پیشانیان دەدرێت یان پێیداغدەکرێن،وە لەڕۆژی زیندووبوونەوە فەرمان دەردەچێت ئادەی دەستەی فیرعەون بخەنەناو توندترین و سەخترین ئازارو ئەشکەنجە.

لەم دوو ئایەتە پیرۆزە بە ڕوون و ئاشکرا دیارە کە فیرعەون و لایەنگرو دۆستانی، لەناو گۆڕدا ئازار دەدرێن، چونکە ئەگەر مەبەستی ئایەتەکە ئازاردانی ناو گۆڕ نەبوایە، ئەوا لە کۆتاییدا پێویستی بە ئامازەکردنی ڕۆژی دوایی نەبوو، ئەگەر بەووردی سەرنجبدەین دەفەرموێت فیرعەون و داروودەستەکەی ئازارێکی ناخۆش دەدرێن لە ئەنجامی ئەو ئاگرەی بەیانیان و ئێواران بۆیان ئامادە دەکرێت و دەیانخەنە ناویەوە، دووەم جاریش لە ڕۆژی دواییدا دەیانخەنە ناو دۆزەخەوە بۆ دژوارترین ئازاردان.

بێگومان ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ بوونی ئازاردانی ناو گۆڕ.

بەڵگەیەکی تر بۆ سەلماندنی ئازاو ئەشکەنجەی ناو گۆڕ، پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۙ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ﴾

واتە:ئەگەر ببینیت کاتێ فریشتەکان لە ڕوخسارو پاشەڵی گاوران دەدەن و پێیان دەڵێن دەی ئازاری سووتان بچێژن.

هەرچەندە هەندێ لە زانایان سەبارەت بەم ئایەتە پیرۆزە دەڵێن لێدانی فریشتەکان لە دوای پرسیارو وەڵامی ناو گۆڕە، کەچی سووتانەکە لە دۆزەخە، بەڵام وێڕای ئەمەش دەڵێین کەواتە سزادانی ناو گۆڕ هەیە، چونکە ئەگەر لێدان و کوتان سزادان و ئەشکەنجەدان نەبێت ئەی چیە؟!.

جگە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێت) لە فەرموودەیەکی ڕاست و دروستدا کە زانای ڕێزدار سوارچاکی بواری فەرموودەکانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) ئیمام ـ ئەبی عەبدوللا موحەممەد ئیسماعیل بوخاری ـ ڕەحمەتی خودای لێبێت ـ لەسەر زاری یاوەری ڕێزدار ـ ئەبو هورەیرە ـ خودا لێڕازیبێت ـ دەڵێ فەرموویەتی:

(اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر ومن عذاب النار... إلخ).

واتە: خودایە من خۆم بەتۆ دەپارێزم لە ئازاری گۆڕ و لە ئازاری ئاگر...هتد.

بێ گومان لەم فەرموودەیە پیرۆزەدا پێغەمبەر(درودی خودای لەسەربێت) بوارو دەرفەتی هیچ گومان و دوودڵییێك نادات لەناو دڵ و دەروونمان بمێنێتەوە، بۆیە بە دڵنیاییەوە دەڵێین ئازاردان و ئەشکەنجەدانی ناو گۆڕ بۆ تاوانبارو بێ باوەڕان هەیە بەڵام لەئاست هەست و بینین و بیستنی ئێمەدا نیە.

**دوا ووتە:**

پەروەردگاری پڕتواناو زۆر زاناو دانا دەسەڵاتی لەسەرووی هەموو دەسەڵاتێکە و بەسەر هەموو دەسەڵاتی بوونەوەراندا زاڵە، لە زۆربەی بارو دۆخ و جۆرو چەشن و قۆناغ و هەوارگەو خۆشی و ناخۆشیەکانی دواڕۆژ ئاگاداری کردووینەتەوەو بۆی ڕوون کردووینەتەوە، بەڵام ڕوونکردنەوەکان بەشێوەیەکی گونجاو بۆ ئەم جیهانە ماددیەو لەئاست ژیان وزانست و زانیاری ئێمەیە، بۆئەوەی ئێمە بتوانین تێیبگەین، چونکە ئێمە شارەزایی و زانیاری و زانستمان تەنیا دەربارەی ئەم شتانە هەیە کە لەم ژیانەو جیهانە ماددیەدا زانیوەو بینیوەو بیستوە، بۆیە پەروەردگاری مەزن

کاتێ باسی شتی(غەیبیمان)واتە نادیارو شاراوەمان بۆ دەکات،بەزمان و بەشێوەی ئەم جیهانە بۆمان باس دەکات و شی دەکاتەوە، چونکە پەروەدگاری کاربەجێ خۆی دروستکاری ئێمەیەو ئێمەی داهێناوە دروستیکردوین بێگومان دەزانێت ئێمە زانیاریمان سەبارەت بەمە هەیە کە لە ژیاندا بینیومانە،ئەگینا ئەم شتانەی (غەیبن) زۆر دوورن لە ئەندێشەو بیرو بۆچوونی ئێمە.

داواکارین لە پەروەردگاری مەزن دڵ و دەروونمان ڕووناك بكات بە ڕووناکی باوەڕی ڕاستەقینە، بەڵکو بگەڕێینەوە بەرەو ڕێگای ڕاست و دروست.

دووبارە سڵاو و درودی خودا بڕژێت بەسەر خۆشەویست وپزیشکی دڵ و دەروونمان موحەممەد لەگەڵ کەسوکارو یاوەرانی وسەرجەم شوێن کەوتوانی تا ڕۆژی کۆتایی.

........

.....

...

.

## سەرچاوەکان


مجمع الأشتات. چاپی یەکەم. بەغدا ساڵی ١٩٨٩. ڕێزدار عەبدوڵڵا مستەفا.

الروح والجسد. چاپی یەکەم. بەیروت. لبنان. ساڵی ١٩٧٤. مستەفا مەحمود.

حقائق الأسلام وأباطيل خصومه. چاپی سێیەم. بەیروت. ساڵی ١٩٦٦. عەباس مەحمود العقاد.

زبدة البخاري. میسر. ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی. عمر ضياءالدين.

تەفسیری ئاسان. نووسینی بورهان موحەممەدەمین عەبدولکەریم.

چەندین ماڵپەڕی ئەنتەرنێت.

## ناوەرۆک

...........

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١١١٢)ی ساڵی ٢٠١١ی زاینی پێدراوە.